# نەوژین

ژمارە (١٠) دوشەممە ٢٠١٧/٩/١٨

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




ڕێنواز، تەمەنێکی کەم و ئەزمونێکی زۆر

7 »»

## بەشودانی کچانی خوار تەمەن ١٨ ساڵ لەگەرمیان رو لە زیادبونە



■ نەوژین

**رێکخراو و لایەنە فەرمییەکان جەختلەوەدەکەنەوە کە لە گەرمیان رێژەی بەشودانی کچان لە خوار تەمەنی یاسایی (١٨ ساڵ) رو لە زیادبونە، ئەمەش چەندین لێکەوتەی خراپی کۆمەڵایەتیی و خێزانیی هەیە.**

ڤیان سابر، بەڕێوەبەری پرۆژەکانی رێکخراوی خەڵک بۆ گەشەپێدان لە گەرمیان، بە (نەوژین)ی وت: «لەگەڵ ئاژانسی سویسریی دا دەستمان بە پرۆژەیەک کردوە بۆ هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵ لەبارەی مەترسیەکانی بەشودانی کچان لە تەمەنێکی مناڵ دا».

وتیشی: «بەپێی بەدواداچون و زانیارییەکانمان، رێژەی حاڵەتەکە لەگەرمیاندا روی لەزیادبون کردوەو ئەمەش مەترسییدارە».

مەترسیەکانیشی بەوشێوەیە رونکردەوە کە «لەروی تەندروستییەوە ئەو کچانە توانای هاوسەرگیرییان نییەو هەروەک لەروی کۆمەڵایەتیی و خێزانیشەوە بەخراپ دەشکێتەوە سەریان، چونکە ئامادەو ساز نین بۆ ئەو فشارانەی کەبەهۆی هاوسەرگیرییەوە دێتە سەریان».

هاوکات بەپێی راپۆرتێکی رۆژنامەی (نەوژین) کە لە لاپەڕە (٣)ی ئەم ژمارەیەدا بڵاوکراوەتەوە، بەشێکی بەرچاو لەو هاوسەرانەی کەلەیەکتری جیا دەبنەوە، ئەو کەسانەن کە لەتەمەنێکی کەمدا هاوسەرگیرییان کردوە.

پارێزەر (لوئەی سەلیم)، قەیرانی دارایی بە هۆکارێکی زۆری کێشەکانی نێوان هاوسەران دادەنێت بەتایبەت ئەوانەی تەمەنیان کەمە، لەوبارەوە وتی: «ئێمە زۆر کەیسمان لایە کە زۆرجار ئافرەت داوای ماڵی جیای کردوە کە هەقی یاسایی و شەرعیی خۆیەتی، بەڵام بە هۆی خراپیی باری ئابوری مێردەکەی ئەم دەرفەتەی بۆ نەڕەخساوە، ئەمەش وایکردوە کێشەکان گەورەتر ببن و جیابونەوەشی بەدوای خۆیدا هێناوە».

هاوکات (نزا محەمەد)، چالاکوانی ژنان، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە هۆکارێکی تر دەزانێت و لەوبارەوە وتی: «نا هۆشیاریی هاوسەران سەبارەت بە بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ جیابونەوە لەو تەمەنە کەمەدا، کە ئەکرێت بە پێچەوانەوە بەکاربهێنرێت بۆ پتەوکردنی ئەو پەیوەندیە».

هاوکات ئیدارەی گەرمیان لە راگەیەنراوێکدا کەلەسەر وێبسایتی خۆی بڵاویکردوەتەوە، جەخت لە زیادبونی حاڵەتەکانی زو بەشودانی کچان لەگەرمیان دەکات.

بەپێی هەواڵەکە، سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان، سەلاح کوێخا، لەدیداری لەگەڵ ژمارەیەک لە زانایانی ئاینی، وتویەتی: «بەپێی بەدواداچونی رێکخراوەکان ژمارەیەکی زۆر کەیس هەبوە کە هاوسەرگیری لە تەمەنی نایاسایی ئەنجامدراوە و زۆربەشیان جیابونەوەی بەدوادا هاتوە و هەندێکجاریش کێشەی کۆمەڵایەتی لێکەوتۆتەوە بەتایبەت ئەو کەیسانە لە خانەقین و جەلەولا تۆمارکراون».



لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دا کچان لەژێر ناوی خوازراودا خۆیان حەشار دەدەن

2»»

## چیرۆکی سەرکەوتنی ژنانی ئیشکەر لە گەرمیان

4»»











ژنانی کفری لە مەلەوانگە و هۆڵی وەرزشیی بێبەشن

3»»

## میمکە سێوە... ژنە شوانەکەی کەلار

6»»





پزیشکێکی چاو: ژنانی گەرمیان زیاتر لەپیاوان سەردانمان دەکەن

10»»

# لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دا کچان لەژێر ناوی خوازراودا خۆیان حەشار دەدەن




**■ نەوژین، ژینۆ عەلی**

**کچان بەشێکی زۆر لە بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پێکدەهێنن، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان بە ناوی ئاشکرای خۆیانەوە لەم تۆڕەدا دەردەکەون، ئەمەش لەلایەک پەیوەندیی هەیە بە باری کۆمەڵایەتییانەوە، لەلایەکی تریشەوە بە مەسەلەی گێچەڵپێکردنیان لەلایەن کوڕانەوە.**

فەیسبوک و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، لەئێستادا وەکو تەونێکی لێهاتوە کە بە دەوری دونیادا درابێت، ژمارەی بەکارهێنەرانیان گەیشتوەتە ملیارەها، لەنێو ئەم ژمارە زۆرەشدا لە کوردستان و گەرمیانیش ژمارەی بەکارهێنەران تادێت بۆ سەرەوە دەکشێت، بەچەشنێک کەم تاکی گەنج هەیە خاوەنی هەژماری خۆی نەبێت.

ئەوەی لەگەرمیان و لەنێو بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدیی دەکرێت، خۆحەشاردانی کچانە لەژێر ناوی دیکەی جیاواز لەناوی راستەقینەی خۆیان. بەشێوەیەک زۆرینەی بەکارهێنەرانی کچ، ناوی ئاشکراو راستەقینەی خۆیان ناخەنە سەر هەژمارەکەیان، بەڵکو پەنا بۆ ناوی خوازراو یان ناوی دیکە دەبەن، یاخود نازناو بۆ ناوەکانیان سەربار دەکەن کە ئەمەش تاڕادەیەک «دەیانشارێتەوە».

هۆکارەکانی ئەم حاڵەتە چییە؟ بۆچی کچان ناوی خۆیان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئاشکرا ناکەن؟ ترسە یان رێگریی، یاخود بۆ ئازادبونی زیاترە؟

ئەم راپۆرتە لەسەر زاری خودی کچان و کەسانی شارەزاوە، بەدواداچون بۆ ئەم پرسە دەکات.

سەرەتا (کەوسەر)ی تەمەن بیست ساڵ، کە ناوی خۆی گۆڕیوە لەفەیسبوک، بۆ (نەوژین) وتی: «پێشتر هەژمارەکەم بەناوی خۆمەوە بو، بەڵام بەهۆکاری ئەوەی کە کوڕە هاوپۆلەکانم زۆر مەسجیان ئەنارد و ئەمەش بو بە هۆی بێزار کردنم، بۆیە ناچار بوم فەیسبوکەکەم ناوی خۆمی لێنەنوسم».

وتیشی: «من پێشوتر هەژمارەکەم ناوی خۆم و وێنەی خۆمی لەسەر بو، بەڵام دواکەوتویی بەشێک لە کوڕانی کۆمەڵگەکەم کە قسەو توانجیان ئەدا، بۆیە ناچار بوم کە ناوی خۆم و وێنەی خۆم بەیەکجاری لابەم».

زۆرینەی ئەو کچانەی کە (نەوژین) دواندنی، باسلەوە دەکەن بەهۆی دەرکەوتنیان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەناو و وێنەی خۆیانەوە، خەڵکیی کێشەیان بۆ دروست دەکردن و قسەی نابەجێیان پێوتون و توانجیان لێداون، ئەمەش وایکردوە بۆنمونە کەسێکی وەکو (کەوسەر) ناچار بێت ناوی خوازراو بۆهەژمارەکەی دابنێت، بەڵام هەندێکی دیکە لەکچانیش لەبەرئەوەی ماڵەوەیان پێیان نەزانن، ناوی خۆیان لەسەر هەژمارەکانیان دانانەن.

ئاسودە، کچێکی ترەو تەمەن ١٧ ساڵە، لەوبارەوە دەڵێت: «زۆرجار بەماڵەوەم وت کە حەز دەکەم وەکو هاورێکانم فەیسبوکم هەبێت، بەڵام ماڵەوە رازی نەبون، بۆیە ناچار بوم بەبێ پرسی ئەوان و بەناوی خوازراوەوە فەیسبوک بەکاربێنم».




دەشڵێت: «هۆکاری ئەوەی کە کچان ناوی خوازراو دادەنەن، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ماڵەوە رێگرن ئەمەش بەهۆی نزمی ئاستی رۆشنبیریی خێزانەکانەوەیە».

توێژەرێکی کۆمەڵایەتی، جەخت لەوە دەکاتەوە کە کەمی رۆشنبیری لای خێزانەکان و کۆمەڵگە بونەتە هۆکار لەبەردەم ئەوەی کچان خۆیان لەژێر ناوی خوازراودا بشارنەوە، جگە لەوەش جیاوازی رەگەزیی وادەکات کچان لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە هەست بە کەمی بکەن و نەبنە خاوەنی شوناسی خۆیان.

کەنار کەمال، توێژەری کۆمەڵایەتی، بۆ (نەوژین) وتی: «بونی جیاوازیی جێندەریی جا لەناو خێزان دا بێت یا لە کۆمەڵگە، وادەکات مافی بەکارهێنانی کارای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەپیاوان ببەخشێت و خانمان بە ترس و دودڵیەوە بەکاری بهێنن ئەمەش بۆ خۆپارێزیان لە روبەڕوبونەوەی کێشە».

دەشڵێت: «ئەم حاڵەتە لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە کاریگەری سلبی دەبێت لەسەر خودی ئافرەت کە ناتوانێت وەک تاکێکی خاوەن شوناس تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەکاربهێنێت، ئەمە جگە لەوەی وێنای کۆمەڵگاش بە کۆمەڵگایەکی پیاوسالارانەی توندوتیژ پیشان دەدات لەبەرامبەر داپۆشین و شاردنەوەی رەگەزی مێ».

ئەگەر بەشێکی بەرچاو لە کچان هۆکاری دانەنانی ناوی خۆیان بۆ رێگری و لێکەوتەی کۆمەڵایەتیی بگێڕنەوە، ئەوا بەشێکی تریان هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە «ناوەکانیان خۆش نییە».

کچێکی تەمەن (٢٥) ساڵ کە ناوی لای (نەوژین) پارێزراوە، ئاماژەی بەوەکرد کە ناوی خۆی پێخۆش نییە، بۆیە کە هەژمارێکی بۆخۆی دورستکردوە، حەزیکردوە بەناوێکی ترەوە دایبنێت کە خۆی پێی خۆشە.

ئەو کچە، وتی: «هیوادارم دایکان و باوکان لەکاتی ناونانی مناڵەکانیاندا بیر لەوە بکەنەوە کە لەکاتی گەورە بونیان دا مناڵەکانیاندا هەست بە ناخۆشی و کەموکورتیەک لە ناوەکەیاندا نەکەن».

---

## توانج و قسەی خەڵکی لەهەمو شتێک زیاتر خەمباریان دەکات

# ئافرەتە کورتە باڵاکانی گەرمیان رەخنەیان هەیە

**■ نەوژین،**
**سازان مستەفا- پەیام جەمال**

**ئەگەر کچان بۆ دەرچونە دەرەوەیان لەماڵەوە خۆیان ئامادە بکەن لەروی جلوبەرگ و ئارایشتەوە، ئەوا (شلێر) دەبێت ئامادەکارییەکی تریش بکات، ئەویش بیستن و روبەڕوبونەوەی قسەو توانج و تانەی خەڵکە. ئەو کە خاوەن پێداویستی تایبەتەو کورتە باڵایە، بەنیگەرانییەوە باسلەوەدەکات کە کۆمەڵگا زۆر روبەڕویان دەبێتەوەو ستەمیان بەرامبەر دەکات.**

شلێر عەبدولکەریم، نمونەی چەندین کچی ناوچەی گەرمیانە کە خاوەنی پێداویستیی تایبەتن و کورتە باڵان، ئەمان بەهۆی ئەو دۆخە تەندروستیی و جەستەییەی تێیدان، لەبری هاوکاریی و بەدەمەوەهاتن، کەچی روبەڕوی سەرزەنشت و توانج و تانەی خەڵکی دەبنەوە، وەک ئەوەی خۆیان بەرپرس بن لەو جەستەو ژیانەی کە هەیانە.

کورتەباڵاکان، بەشێکن لەو کەسانەی کە بە خاوەن پێداویستیی تایبەت هەژمار دەکرێن، ئەوان بەهۆکاری بۆماوەیی یان کێشەیەک لە پێکهاتەی جەستەیی و جینیی و هۆرمۆنیان دا، جەستەیان وەکو مرۆڤی ئاسایی نییە، بەڵکو باڵایان کورتەو هەروەها هەندێک پەل و بەشی جەستەیان لەوانی تر درێژ یان کورت تر یان گەورەتر یاخود بچوکترن، بەجیاوازی جۆر و حاڵەتەکان.

لەگەرمیاندا ژمارەیەک کورتە باڵا هەن کە بەشێکی بەرچاویان لە رەگەزی مێن، ئەوان وەک بۆ (نەوژین) باسیان لێوە کرد، بەهۆی بارودۆخی جەستەییەوە، روبەروی سەختیەکی زۆر دەبنەوە.

شلێر عەبدولکەریم، ئەو کچەی لەسەرەتادا ناومان هێنا، تەمەنی ٣٧ ساڵە، ئاماژەی بەوەکرد کە خەمێکی گەورەی ئەوان بریتییە لە قسەو توانجی کۆمەڵگا. وتی: «توانجی زۆرمان لێ دەدرێت، ئیتر چ لەبازاڕ بم یان دکتۆر تەنانەت لە کۆڵانەکەی خۆشمان قسە و توانجیان لێداوم».

ئەو کچە وتیشی: «جاران زور خەفەتم بە قسەی خەڵک ئەخوارد و دڵتەنگ دەبوم، بەڵام ئێستا هیچ گرنگی بەو قسانە نادەم، چونکە تێگەیشتم لەوەی خەڵک قسە لەسەر هەمو شتێک ئەکات تەنانەت لەسەر مردوی ناو گوڕیش».

سەرباری ئەم تێروانینە خراپەی کۆمەڵگا، بەڵام ئافرەتانی کورتەباڵا لەگەرمیان، دەستەوەستان نەماون و خۆیان تەسلیمی ئەو تێڕوانینە نەکردوە، بەڵکو بەشێکیان توانیویانە خوێندن تەواو بکەن.

لاوێن نەجم، کچێکی کورتە باڵایە و تەمەنی ٢٥ ساڵە، کورتە باڵایی رێگری لێنەکردوە دەستبەرداری خەونەکانی بێت، بەڵکو توانیویەتی بەشی کارەبا لە ئامادەیی پیشەیی تەواو بکات.

(لاوێن)یش وەکو هاورێیانی دیکەی هەمان کێشەی لەگەڵ قسەو توانجی کۆمەڵگادا هەیە، لەوبارەوە وتی: «رۆژ نەبوە گوێم لە قسەی خەڵک نەبێت، ئەبێت هەر کە دەرچوین لەماڵەوە خۆمان بۆ قسەی خەڵک ئامادە بکەین، بەڵام ئێمە گوێ بەقسەی ئەوان نادەین هەرچەندە هەندێکجار قسەی زور ناخۆشیش دەبیستین».

بەپێی ئاماری لقی گەرمیانی کۆمەڵەی کورتەباڵاکانی کوردستان، لە سنورەکەدا نزیکەی ١٥٠ کورتەباڵا هەیە. بەوتەی سەرۆکی لقەکەش، گەورەترین کێشەیان، بڕینی موچەکانیان و خراپی دۆخی ئابورییانە.


کۆبونەوەیەکی کۆمەڵەی کورتەباڵاکانی کوردستان

رێبوار حسێن فەرهاد، سەرۆکی لقی گەرمیانی کۆمەڵەی کورتەباڵاکانی کوردستان، بۆ (نەوژین) وتی: «کێشە وموعاناتی کورتەباڵاکان لە ئێستادا نەبونی موچەیە کە پێشتر ١٥٠ هەزار دینار بوە، بەڵام بەهۆی قەیرانی داراییەوە کەمکراوەتەوە بۆ ٩٠ هەزار دینار، کە ئەمەش بەگشتی بەشی تەواوی پێداویستیەکانمان ناکات».

باسیلەوەشکرد کە قەیرانی دارایی رۆڵی لەوەشدا بینیوە کە لقەکەیان چالاکیەکانیان وەکو پێشوتر نەمێنێت و سست بێت. وتی: «پێش قەیرانی دارایی چالاکی زۆرمان هەبو، بەتایبەتی لەروی کۆکردنەوەی ئەندامان و بەیەک ناساندنیان، بەڵام لەئێستادا چالاکیمان زۆر کەم بوەتەوە و ئەوەشی کە هەمانە بەهاوکاری هەندێک لە کۆمپانیاو خێرخوازان دەیکەین».

چ کێشەی جەستەیی و موعاناتی قسەوقسەڵۆکی خەڵکی و چ کێشەو قەیرانی دارایی، واینەکردوە کە ئەو توێژە دەستبەداری ژیانیان بن، بەڵکو هەندێک لەو ئافرەتانە ژیانی هاوسەرگیرییان پێکهێناوە.

نەرمین عەباس، ٣٨ ساڵ، ژنێکی دیکەی کورتەباڵایە، ماوەی ٤ ساڵە هاوسەرگیریی کردوەو هاوسەرەکەشی خاوەن پێداویستیی تایبەتە.

بۆ (نەوژین) وتی: «بەداخەوە نەمتوانی درێژە بەخوێندنەکەم بدەم و وازم لێهێنا، بەڵام سەرباری ئەوەش زۆر هیواو ئارەزوم هەیە کە یەکێک لەوانە ئیشی دەستییە، کەخوازیارم بتوانم ئەو پیشەیە فێر ببم و وەکو سەرچاوەیەکی بژێویی بۆ خۆم و خێزانەکەم سودی لێ ببینم».

# زو هاوسەرگیریی دەکەن و زوش لەیەک جیادەبنەوە

## پارێزەرێک: ڕێژەی جیابونەوەی ئەو هاوسەرانەی تەمەنیان کەمە زیادیکردوە



■ نەوژین، زریان محەمەد

**بەشێک لە پارێزەر و چالاکوانان لەگەرمیان ئاماژە بەوەدەکەن کە ڕێژەی جیابونەوەی ئەو هاوسەرانەی تەمەنیان کەمە، روی لە زیادبون کردوە، بەشێک لەهۆکارەکانیش بۆ ئەوەدەگێڕنەوە کە ئەو کەسانە پێش ئەوەی بەتەواوی پێبگەن، هاوسەرگیرییان کردوە.**

ئەگەچی هیچ ئامار و داتایەکی ورد نییە کە پشتڕاستی ئەوە بکاتەوە زۆرترین حاڵەتەکانی جیابونەوەی هاوسەران ئەوانەن کەلەتەمەنێکی کەمدا هاوسەرگیرییان کردوە، بەڵام ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن کە زۆرێک لەو هاوسەرانە کەمتر بەرگەی فشاری خێزانداریی دەگرن، هەربۆیە کێشەکانیشیان زۆرتر دەبێت، کە سەرەنجام بە جیابونەوە کۆتاییان پێدێت.

ئارەزو، ناوی ژنێکی تەمەن (٢٠) ساڵی دانیشتوی گەرمیانە، ماوەی زیاتر لە (٢) ساڵە لە هاوسەرەکەی جیابوەتەوە. بۆ (نەوژین ) وتی: «من تەمەنم ١٦ ساڵ بو ژیانی هاوسەریم پێکهێنا بە ویستی خۆم، بەڵام ئەوە بۆ ماوەی دو ساڵە لە هاوسەرەکەم جیابومەتەوە، هۆکاری جیابونەوەکەشم نەبونی متمانەبو لە نێوانمادا، چونکە مێردەکەم هەرکێشەیەکمان هەبوایە پەیوەندی بە ماڵی خەزورم دەکرد و منی شەرمەزار دەکرد».

وتیشی: «ئەو ماوەیەی کە لەگەڵی بوم زۆر هەوڵم ئەدا تێیبگەیەنم کە ژن و مێرد ئەبێت متمانەی تەواویان بەیەک هەبێت بۆ ئەوەی بتوانن باسی تەواوی کێشەکانی ژیانیان بکەن و پێکەوە چارەسەری بکەن، بەڵام سودی نەبو، هەرئەمەش وایکرد کە لێی جیاببمەوە».

جیابونەوەی هاوسەران لە هەرتەمەنێکدا بێت هۆکاری تایبەت بە خۆی هەیە، لەهەموشیان دیارتر دەستوەردانی خێزانەکان و کەسی سێیەمە لە نێوان هاوسەران دا.

بینایی، ناوی خوازراوی ژنێکی دیکەی تەمەن ٢٢ساڵانە، کە ئەویش لەهاوسەرەکەی جیابوەتەوە، بۆ (نەوژین) باسی جیابونەوەی خۆی لە هاوسەرەکەی کرد و وتی: «من لە تەمەنێکی کەمدا لەلایەن خێزانەکەمەوە بەشودرام، سەرەڕای ئەوەی کە مێردەکەم زۆر غیرەی دەکرد واتە (دڵپیس) بو، لەگەڵ ئەوەش هەمو شتێکم قەبوڵ دەکرد، بەڵام دەستوەردانی خەسوم لە ژیانی هاوسەرێتیمان، وایلێکردم کە لێی جیاببمەوە، لە کاتێکدا مناڵێکی تەمەن ٢ ساڵانیشم لێی هەبو کە بەناچاری بەجێمهێشت».

دەشڵێت: «پاش ماوەیەک لەجیابونەوەمان، مێردەکەم ژنێکی دیکەی هێنا، سەرەڕای ئەمەش پەشیمان بوە و داوایلێکردم بگەڕێمەوە بۆلای، منیش بەهۆی مناڵەکەمەوە قەبوڵمکرد بگەڕێمەوە، بەڵام بەو مەرجەی ژنی دوەمی تەڵاق بدات».

بینایی، بە حەسرەتێکی زۆرەوە بۆ کۆرپە لەدەستچوەکەی ئاماژەی بەوەکرد: «نە ئەو ژنی دوەمی تەڵاق دا و نەمنیش کۆرپەکەمم بەدەست هێنایەوە».

لە شرۆڤەکردنی هۆکاری بەرزبونەوەی ڕێژەی جیابونەوەی ئەو کەسانەی لەتەمەنێکی کەمدا هاوسەرگیرییان کردوە، پارێزەرێک باس لە کۆمەڵێک خاڵ و تێبینیی دەکات.

لوئەی سەلیم، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «لە ئێستادا قەیرانی دارایی بە هۆکارێکی زۆری کێشەکانی نێوان هاوسەران دادەنرێت، چونکە ئێمە زۆر کەیسمان لایە کە زۆر جار ئافرەت داوای ماڵی جیای کردوە کە هەقی یاسایی و شەرعیی خۆیەتی، بەڵام بە هۆی خراپیی باری ئابوری مێردەکەی ئەم دەرفەتەی بۆ نەڕەخساوە، ئەمەش وایکردوە کێشەکان گەورەتر ببن و جیابونەوەشی بەدوای خۆیدا هێناوە».

لەبەرامبەریشدا چالاکوانێکی ژنان جگە لە قەیرانی دارایی، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە هۆکارێکی جیابونەوەی هاوسەران دەزانێت لەتەمەنێکی کەم دا.

نزا محەمەد، بۆ (نەوژین) وتی: «نا هۆشیاریی هاوسەران سەبارەت بە بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ جیابونەوە لەو تەمەنە کەمەدا، کە ئەکرێت بە پێچەوانەوە بەکاربهێنرێت بۆ پتەوکردنی ئەو پەیوەندیە».

بەهەمان شێوەی ئەو چالاکوانە، لوئەی سەلیم، جەختیکردەوە: «تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هۆکارێکی تری لێکدابڕانی خێزانەکانە لەیەکتری، لەوەش گرنگتر بوەتە هۆکارێک بۆ جیابونەوەی هاوسەران، ئەمەش بەهۆی نەبونی وشیاری یاسایی و کۆمەڵایەتیی لە بەکارهێنانیدا».

هاوکات (نزا محەمەد)ی چالاکوان، لەباسکردنی هۆکارەکانیشدا، دراما تەلەفزیۆنەکانی سەربار کرد «ئەو دراما زۆرانەی کە بەبێ سانسۆر لە کەناڵە کوردیەکان پەخشدەکرێن، هۆکارێکی ترن، چونکە خێزانی ئێمە لە قەیراندایە و هەر ڕۆژەو خشتێک لە شکۆی خێزان لادەبرێت، بۆیە زۆرجار دراماکانیش هۆکاری روخاندنی ئەو کۆشکی شکۆیەن».

بەڵام توێژەرێک، رایەکی جیاوازی هەیە لەوەی ئەو چالاکوان و پارێزەرە باسیان لێوەکرد، ئەو پێیوایە لەبنەچەوە بەشێکی زۆری کچان و کوڕان ئامادە و ساز نین بۆ ئەم پرۆسەیەو لەتەمەنێکی کەمدا هاوسەرگیریی دەکەن بەبێ ئەوەی فشارەکانی ئەم پرۆسەیە تێبگەن.

ئاسۆ خەلیل، توێژەری دەرونی، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «زۆرجار گەنجان هاوسەرگیریی بە ڕێگە چارە دەزانن بۆ گەیشتنیان بە خولیاکانیان، بەڵام کاتێک دەچنە ناو ئەو پرۆسەیە و بەرپرسیارێتی کەسێکی تری دەکەوێتە ئەستۆیان، دەبینن شتەکان بەوجۆرە نییە کە وێنایان بۆ کردوە»

وتیشی: «ئەمەش وادەکات توشی نائومێدی زۆر ببن لەو خەیاڵەی کردویانە، کە وادەکات کێشە دروست ببێت و کەڵەکەبونی کێشەکانیش سەردەکێشێت بۆ لێکجیابونەوە».

رونیشیکردەوە: «گرنگە گەنجان لەتەمەنێکی کەمدا هاوسەریگریی نەکەن، چونکە زۆرێک لەو گەنجانەی لەو تەمەنەدا هاوسەرگیرییان کردوەو دواتر جیابونەتەوە، توشی داڕوخانێکی زۆری دەرونی بونەتەوە».

# ژنانی کفری لە مەلەوانگەو هۆڵی وەرزشیی بێبەشن

■ نەوژین، ئەشرەف ئەحمەد

**ئەگەرچی ماوەیەکە کردنەوەی مەلەوانگەو هۆڵەکانی لەشجوانی و وەرزشیی تایبەت بە ژنان لە کوردستان و گەرمیان برەوی پەیدا کردوە، بەڵام هێشتا لە قەزای کفری، هیچ هۆڵێکی گشتی و تایبەت نییە کە ژنان بتوانن وەرزشی تێدا بکەن، چالاکوانان لەوبارەوە رەخنەیان هەیە، خاوەنکارەکانیش نەکردنەوەی هۆڵی لەوشێوەیە بۆ زۆریی تێچون دەگێڕنەوە.**

> وەکو ئافرەتانی شارەکانی تر مافی سود ببینینمان هەیە لە پرۆژەی وەرزشیی

کفری، یەکێکە لە دێرینترین قەزاکانی عێراق و کوردستان، سەرباری هەمو ئەو تێبینییانەی ژنان و چالاکوانان هەیانە لەبارەی رەوشی ژنان و نەبونی خزمەتگوزاریی و پرۆژەی تەرفیهی و رۆشنبیریی بۆیان، بەتایبەتیش رەخنەیان لەوە هەیە کە هیچ مەلەوانگەو هۆڵێکی وەرزشی تایبەت بەوان بونی نییە، ئەمەش لەکاتێکدایە کە لە قەزای کەلاری هاوشانی قەزاکەیان، چەندین هۆڵ و ناوەندی حکومیی و تایبەت بۆ وەرزشی ژنان کراونەتەوە.

سارە حوسین، ٢٩ ساڵ، چالاکوانی ژنانە، ئاماژەی بەوەکرد ئەوان بەردەوام داواکارییان کردوە بۆ کردنەوەی مەلەوانگە و هۆڵێکی لەشجوانی تایبەت بە خانمان، بەڵام تاوەکو ئێستا داواکارییەکەیان جێبەجێ نەکراوە.

وتیشی: «داوکارین لە حکومەت و لایەنە پەیوەندیدارەکان هەوڵی جدی بدەن تاوەکو چیتر هەر داوا نەکەین، چونکە ئێمەش وەکو هەمو ئافرەتان و کچانی شارەکانی تر مافی ئەوەمان هەیە سود لە پرۆژە و شوێنی تەرفیهیی و وەرزشیی ببینین».

دەلال سەمین، ٢٦ ساڵ، چالاکوانی بواری ژنانە لە کفری، هاوڕایە لەگەڵ بۆچونەکانی (سارە) و پێیوایە ئەوان وەکو ژنانی کفری غەدریان لێدەکرێت.

بۆ (نەوژین) وتی: «ئێمەی ئافرەتانی قەزای کفری بەردەوام بێبەش بوینە لە زۆر بوار، پێویستە حکومەت لایەنەکان ئاوڕی زیاتر لە ژنان و کچانی شارەکەمان بدەنەوە، چونکە ئێمەش مافمان هەیە، بەڵام بەداخەوە پشتگوێ خراوین».

لەبارەی ئەو هەوڵانەی کەچالاکوانان داویانە بۆ کردنەوەی ناوەند و هۆڵی وەرزشی و مەلەوانگەی تایبەت بەخۆیان، (دەلال) وتی: «ئێمە بەردوام داوای کردنەوەی مەلەوانگە و هۆڵی لەشجوانی ئافرەتان دەکەین، چونکە قەزای کفری زۆر دورە دەستە و بەمهۆیەشەوە زۆر پشگوێ خراوە».

لەبەرامبەر ئەم داواکاریەی ژنانی کفری، سەرۆکی شارەوانی باسلەوەدەکات کە نەخۆیان هیچیان پێدەکرێت، نە لەو بروایەشدایە کەرتی تایبەتیش کارێک بکات.

وەسفی عومەر، بۆ (نەوژین) وتی: «ئێمە بەهۆی قەیرانی داراییەوە ناتوانین هیچ پرۆژەیەک ئەنجام بدەین، بەڵام لەئێستاداو لەرێگەی کەرتی تایبەتەوە، پرۆژەی مەلەوانگەیەکی داخراو لە بواری جێبەجێکردندایە، ئیتر لەدەستی وەبەرهێنەرەکەدایە کە بۆ چ رەگەزێک تەرخانی دەکات، ئایا تایبەت دەبێت بۆ پیاوان یاخود ئافرەتانیش دەگرێتەوە».

سەرۆکی شارەوانی، ئەوەشی وت کە ئەوان لەحاڵەتی بونی پرۆژەیەک بۆ کردنەوەی ناوەند و هۆڵ و مەلەوانگە بۆ ژنان لەلایەن سەرمایەدار و خاوەنکارەکانەوە، ئامادەن ئاسانکاریی بۆ بکەن و زەوی بۆ تەرخان بکەن.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە بەرپرسێک ئاماژە بەوەدەکات کە پرۆژەیەکی هاوشێوەی حکومیی هەبوە بۆ ژنان، کەبەهۆی قەیرانی داراییەوە تەواو نەکرا.

هیوا محەمەد حەسەن، بەڕێوەبەری ناوەندی وەرزش و لاوانی کفری، بۆ (نەوژین) وتی: «لە کاتی سەردانی جێگری سەرۆکی حکومەت داواکاریەکمان ئاراستەی کرد بۆ دابینکردنی ئامێری وەرزشی بۆ کردنەوەی هۆڵی لەشجوانی ئافرەتان، خۆشبەختانە داوکاریەکانمان جێبەجێ کران و لە ماوەیەکی نزیک دا هۆڵی تایبەتی وەرزشی بۆ ژنانی کفری دەکەینەوە».

سەبارەت بە کردنەوەی مەلەوانگەش، بەڕێوەبەرەکەی وەرزش و لاوانی کفری ئاماژەی بەوەکرد داواکاریان زۆر کردوە، بەڵام قەیرانی دارایی هەمو کارەکانی وەستاندوە.

بەدەر لەهەوڵە حکومیەکان کەوادیارە بەهۆی قەیرانی داراییەوە پەکیان کەوتوە، لەکفری دا لەلایەن کەرتی تایبەتیشەوە ئاوڕێک لە ژنان نەدراوەتەوە، ئەگەرچی چەندین هۆڵی وەرزشیی بۆ پیاوان هەیە، بەڵام هیچ هۆڵێکیان ئامادە نین بەشێکی کاتەکانیان تەرخان بکەن بۆ ژنان.

ئاسۆ عوسمان، خاوەنی هۆڵی لەشجوانی گەنجانی کفری، ئاماژەی بەوەکرد کردنەوەی هۆڵێک بەتایبەت بۆ ژنان کارێکی قورسە، «چونکە ئامێرەکانی لەشجوانی ژنان جیاوازە لەهی پیاوان و تێچونی زۆری دەوێت، ئەمە جگە لەوەی پێویستی بەراهێنەرە».

وتیشی: «زۆر لە ئافرەتان و رێکخراوەکانیان هاتوم بۆلام داوایانکردوە هۆڵێکی تایبەتیان بۆ بکەمەوە، بەڵام ناتوانم ئەو کارە بکەم بەهۆی ئەوەی تێچونی زۆرە».



# چیرۆکی سەرکەوتنی ژنانی ئیشکەر لە گەرمیان










■ نەوژین، لەیلا ئەحمەد *

**چەند ساڵێکە ڕێژەی ژنانی ئیشکەر لەگەرمیان رو لە زیادبونە، سەرباری ئاستەنگ و ڕێگرییە کۆمەڵایەتییەکان، ژنان توانیویانە پەرە بەو تواناو بەهرەیە بدەن کە هەیانەو لە مەیدانی ئیشکردندا بیخەنەگەڕ، وەک ژنانی ئیشکەر باسی لێوە دەکەن ئەمەش لەلایەک ئاسودەیی بۆ خۆیان دروستکردوە، لەلایەکی دیکەشەوە بوە بە سەرچاوەیەکی بژێویی باش بۆ خۆیان و خێزانەکانیان.**

لەوەتـــەی قەیرانی دارایی روی لەهەرێم کردوە، ئەوەی تێبینیی دەکرێت ئەوەیە ڕێـــژەی کارکردنـــی ژنان زیاتـــر بوە، بەشـــێوەیەک ژنان لەتەک ئیشـــوکاری ماڵـــەوە، دەیانەوێـــت بەشـــێک لـــەو قورساییە داراییە کەمبکەنەوە کەبەهۆی بارودۆخی ئابورییەوە لەسەریانە، ئەوان لەڕێگەی ئیشـــکردنیانەوە، توانیویانە ببنە پاڵپشت و سەرچاوەیەکی بژێویی باش بۆ خێزان و هاوسەرەکانیان.

لەمیانـــەی ئـــەم راپۆرتـــەوە، هـــەوڵ دەدەین ئاشـــناتان بکەین بە چیرۆکی دەســـتپێکردنی کاری چەنـــد ژنێک و هەروەها ئەو هەنگاوانەی گرتویانەتەبەر بۆ سەرکەوتنیان لە کارەکەیان.

### لەگرفتی دەرونییەوە بۆ خاوەنکاریی

شـــەرمین محەمەد، ژنێکی خاوەنکاری دانیشـــتوی گەرمیانە، ئەندامی یەکێک بو لەو خێزانانەی کە قەیران و کێشەی دارایی و لاوازی باری ئابوریی، وایلێکردبو کە توشـــی خەمۆکی و چەندین گرفتی دەرونیی بکات.

بەڵام ئەم ژنە، رۆژێک بڕیار دەدات، چیتر بەردەوام نەبێت لە خەمخواردن، بەڵکو ئەو وزەیەی کە هەیەتی، لە ئەنجامدانی پرۆژەیەکـــدا بەکاربهێنـــێ کەبەهۆیەوە رەوشی ژیانیان بەرەو باشتر بڕوات.

وەک خۆی بـــۆ (نەوژین) ئاماژەی پێدا «بیرم لەکارکردن کردەوەو بەمێردەکەمم وت دوکانداریی دەکەم، سەرەتا قەبوڵی نەکردو وتی تـــۆ گەنج و جوانی ئابڕوم ئەچێـــت و لەناو خەڵـــک روبەڕوی زۆر کێشـــەو گرفت بومەوە، بەڵام سوربوم لەسەر کارکردن تامێردەکەمم رازیکردو ماوەی چەند مانگێکـــە لەناو ماڵەکەی خۆمـــدا دوکانێکـــم کردوەتـــەوە بـــۆ فرۆشتنی کراسی ژنان و منالاَن و شتی هەمەجۆر».

وتیشـــی: «بەهـــۆی ئـــەم کارەوە، لە قەیران و نەخۆش دەرونی و کێشـــەی ئابـــوری رزگارم بو، ئێســـتا هەم خۆم خۆشـــحاڵم و هـــەم مێردەکەمیش زۆر دڵخۆشەو یارمەتیدەرمە».

شـــەرمین، بە شـــانازییەکەوە رێنمایی ژنانی کرد «داواکارم لە ژنان هۆشیار بن و نەترسن لەکارکردن، چونکە ئەگەر چاو لەمـــن بکەن کە مـــن یەکێکم لەو ژنانەی کەپێشـــتر توشـــی کێشەی زۆر ببوم، بەڵام ئێستا باشم و کێشەم کەمە و دەرونم ئاســـودەیەو یارمەتی خۆم و خێزانەکەشم دەدەم».

جەختیشـــیکردەوە: «ئـــەو ســـنورەم شـــکاندوە کەئێژن ژن ناتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت».

### ئەو ژنەی ڕێگریی خێزانیی چۆکی پێدانەدا

کەژاڵ رەشید، ژنیکی دیکەی خاوەنکارە لەگەرمیان. گەیشتنی بەو ئامانجەی کە هەیبوە ئاسان نەبوە، بەڵکو ڕێگرییەکی زۆری لێکـــراوەو ئاســـتەنگی زۆری بۆ دروست کراوە.

ئـــەو چیرۆکی خـــۆی بەمشـــێوەیە بۆ (نەوژیـــن) گێڕایەوە: «مـــن خاوەنی منالَـــم، بەهـــۆی قەیرانـــی داراییەوە کێشـــەی دابینکردنی بژێـــوی ژیانمان بەرۆکی گرتبوین، بیرم لەوەکردەوە کە ڕێگەچارەیەک بۆ دەربازبون لەم حاڵەی تێیدام بدۆزمەوە».

کەژاڵ، بیـــر لەوەدەکاتـــەوە کە ببێتە پیشـــەوەر و لەرێگـــەی پیشـــەکەیەوە خێزانەکـــەی لەو دۆخـــە داراییە خراپە رزگار بـــکات کەتیایەتـــی، بـــۆ ئـــەم مەبەستەش دەیەوێت بەشداریی خولی فێربونی درومان بـــکات و دواتر ببێتە بەرگدور.

بەڵام ئـــەم خولیایە، بە ئاســـانی بۆی نایەتە دی، چونکە لەلایەن کەسوکاری هاوسەرەکەیەوە ڕێگریی زۆری لێکراوە.

وەکخۆی وتی: «کەسوکاری مێردەکەم بەهۆی لایەنی ئاینیی و کۆمەڵایەتییەوە، ڕێگریـــان لێدەکـــردم کار بکەن و هانی مێردەکەمیـــان دەدا ڕێگرییم لێبکات و نەهێڵێت لەماڵ بێمە دەر و ســـەرپۆش بەسەردا بدەم».

مـــرۆڤ کاتێک ســـور دەبێت لەســـەر بڕیارێک، ئەوا ئاســـتەنگەکانیش ئەگەر زۆریـــش بن، بەڵام چۆکـــی پێدانادەن، بەڵکو وادەکات ســـور تر بێت لەســـەر بەدیهێنانـــی ئـــەو ئامانـــج و بڕیارەی.

هەربۆیـــە (کەژاڵ)یـــش ڕێگریـــەکان ساردی ناکەنەوە و لە تەقەلای ناخەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو بەشـــداری لە خولـــی فێربونی درومان دەکات و فێری بنەماکانی ئەو پیشەیە دەبێت.

باســـیلەوەکرد کە «هەندێک لەپیاوان مەبەســـتیانە ژن ناهۆشـــیار بێـــت و سەرکوتی کەن، ئەگینا خولی درومان و کارکردن چ خراپیەکی هەیە؟».

ئاماژەی دا هەربۆیـــە ئەو توانیویەتی بڕوا بە هاوســـەرەکەی بێنێت و رازیی بکات بـــەوەی ئەو هونـــەرەی فێربوە پەرەی پێبـــدات و دەســـتبداتە کاری بەرگدوری.

کەژاڵ، بە شانازییەکەوە وتی: «ئەوان بـــەردەوام بون لەقســـەی ناشـــرین و توندوتیژی و ســـوکایەتی، بەڵام منیش ســـور بوم لەســـەر بڕیارەکەم و کۆڵم نەدا، ئێستا بەرگدورم و خاوەنی پیشەو داهاتـــم، دوکانێکی تایبـــەت بەخۆمم کردوەتـــەوەو بژێـــوی ژیانمـــان دابین دەکەم».

ئاماژەی بەوەدا چونکە ئەو لەسەر هەق بوە، هەربۆیە لەکۆتاییدا ئەو سەرکەوتو بوەو توانیویەتی نـــەک بەتەنیا حەز و خولیای خۆی جێبەجـــێ بکات، بەڵکو بڕواش بە کەســـوکاری هاوسەرەکەشی بێنێت کە ئەوان هەڵەن لەو تێڕوانینەی کە هەیانە بۆ ژن.

وتـــی: «ئـــەوان تێگەیشـــتن لـــەوەی کەئافـــرەت ئابڕوبەر نییـــە وەکخۆیان باســـیان لێوە دەکـــرد، بەڵکو ئافرەت دەتوانێـــت بژێـــوی دابیـــن بـــکات و مافی خۆیەتـــی ئازادانـــە کار بکات و بژێت، ئێســـتا ئەوان متمانەیان پێمەو ڕێگەیانداوە هاوسەر و کچەکانیان بێنە ناو خول و فێری کارکردن بن».

### کچە ئیشکەرەکە

ئەگەر ئـــەو دو نمونەیەی لەپێشـــتردا ئاماژەمـــان پێدا باس لـــە تێکەڵبونی ئەو ژنانە بـــکات بەکارکردن کەخاوەنی خێزانـــن، ئەوا ئەم نمونەیـــە جیاوازە، چونکـــە لێـــرەدا ســـەربوردەی کچێک دەگێڕینەوە کە توانیویەتی شـــانبداتە ژێر بـــاری کارکردن و لـــەو ڕێگەیەوە بژێویی خێزانەکەی دابین بکات.

شـــیلان ئیبراهیم، کچێکی خاوەنکاری خەڵکـــی گەرمیانە، ئامـــاژەی بەوەکرد کە ماوەی ســـاڵێکە دەستی بەکارکردن کردوەو ئێستاش خۆشحاڵ و ئاسودەیە بەکارەکەی.

وتی: «ئێمە خێزانێکی گەورەین و کەس نییە بژێویمان دابین بکات، نەمدەتوانی لەترسی قســـەو بوختانی خەڵک بڕۆمە دەرەوە و کار بکـــەم، بەوهۆیـــەوە کێشەمان زۆر بو».

شـــیلان، وەکخۆی ئامـــاژەی بۆ دەکات کـــە پێی لە جەرگی خۆی ناوەو بڕیاری داوە بەرگەی توانج و قســـەی خەڵکیی بگرێـــت، چونکـــە بەنیســـبەت ئەوەوە خێزانەکەی گرنگ تر بوە بەلایەوە هەتا قسەی خەڵکی.

وتـــی: «ئێمە لەماڵـــەوە باوکم کۆچی دوایـــی کردوەو دایکیشـــم نەخۆشـــیی هەیە، خوشـــکێکی بێوەژنمان لەگەڵە کە هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردوەو خـــۆی و منالەکانی لەگـــەڵ ئێمەن و ماڵـــە خەزورانی ڕێگە نادەن کار بکات، بۆیـــە بڕیارم دا من ئـــەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ».

باســـیلەوەکرد کـــە ســـەرەتا بە ترس و دڵەراوەکـــێ و بەناچـــاری دەســـتی بەکارکردن کردوە، بەڵام ئێستا دڵخۆش و ئاســـودەیە بـــەکار و داهاتەکـــەی.

وەکخۆی وتی: «خۆزگە دەخوازم زو تر دەستم بەکارکردن بکردایە».

### ئەو کچەی شوێنی باوک و برای گرتوەتەوە

دوا چیـــرۆک و گێڕانـــەوە، هی کچێکی دیکەیە بەنـــاوی (ژیـــان)، کچێک کە شـــوێنی باوک و برای بـــۆ خێزانەکەی پڕکردوەتەوە، لەرێگەی ئەو ئیشوکارانەی کە دەیکات.

بۆ (نەوژین) وتی: «من و خوشکەکانم لەگەڵ دایکمان دا دەژین، نەباوکم هەیەو نەبرا، بۆیـــە دابینکردنی بژێوییمان زۆر قورس و نارەحەت بو».

ئامـــاژەی دا کە دایکـــی بەکارگوزاریی بژێویانـــی پەیداکـــردوە، ئەویـــش بەشێوەیەکی «مەمرەو مەژی».

ژیان، باسیلەوەکرد کە سەرباری ئەوەی بژێوییـــان خراپ بوەو جگـــە لە موچە کەمەکەی دایکـــی، داهاتـــی دیکەیان نەبـــوە، بـــەڵام پێی شـــەرم بـــوە کە کاربکەن، ئەویش لەبەر قســـەو توانجی خەڵکی.

بەڵام ئـــەم کچە بڕیـــار دەدات کە ئەو قسەو بارە کۆمەڵایەتییە نەیترسێنێت، بەڵکو بەپێچەوانـــەوە کارێک بکات کە هەمو ئەوانەی کارکردنی ژنان بە عەیبە دەزانن، را بگۆڕن. هەربۆیە بڕیار دەدات و دەست بەکارکردن دەکات.

ژیـــان، باســـیلەوەکرد: «بڕیارمـــدا یارمەتیـــدەری دایکـــە کارگـــوزارە نەخۆشەکەم بم و گوێ بەقسەی خەڵک نـــەدەم، هەربۆیە هاتمە بـــازاڕ و بومە بەرگدور، خۆشبەختانە ئێستا خاوەنی پیشەو داهاتی خۆمم».

### کارکردنی ژنانی گەرمیان لە کەرتی تایبەت بەرەو کوێ؟

بەپێی ئـــەو بەدواداچونانەی من لەگەڵ هاوکارانم لـــە تیمی رێکخـــراوی وادی لەگەرمیان ئەنجاممان داوە، ئەوەمان بۆ دەرکەوتوە کە لەئێستادا ژنانی گەرمیان چ لەناو شـــار بێت یـــان لادێ، هەوڵی بون بەخاوەنی پیشەی تایبەتی خۆیان دەدەن.

هەربەپێی بەدواداچونەکانمان، بەشێکی زۆری هەوڵـــی کارکردنـــی ژنـــان بەو ئامانجەیـــە کـــە ببنە خـــاوەن داهاتی خۆیـــان و بژێوی ژیانیـــان دابین بکەن و گوزەرانێکـــی باشـــتر بـــۆ خۆیان و خێزانەکانیان دەستەبەر بکەن.

دەرفەتـــی کارکردنی ژنان لەشـــارەکان رەنگە باشـــتر بێت، ئەمیـــش بەهۆی بونی زەمینەی کاری زۆرتر و فرۆشگا و دوکان و شوێنکاری زیاتر.

هـــاوکات هۆکارێکی تریش بۆ باشـــیی دەرفەتی ئیش بۆ ژنان لە شـــارەکان، دەگەڕێتەوە بـــۆ بونی خول و ناوەند و شـــوێنی پێگەیاندن و فێرکردنی پیشە بۆ ژنـــان، بەڵام لە گونـــدەکان دا ئەو دەرفەتە کەمترە، هـــەر بۆیە بیرۆکەی فێربونـــی کار و داواکاری بۆ کردنەوەی خولەکانی فێربونی پیشەکان لەلادێکان خواستێکی زۆری ژنانە لەرێکخراوەکان و لایەنەکانی تر تابتوانن ئەو ئاواتانەی هەیانە لە ژیانێکی باشتر و گوزەرانێکی شەرەفمەندانە، بەدەستی بێنن.

* ئەندامـــی تیمـــی ڕێکخـــراوی وادی لەگەرمیان

# ژنانی ئاوارە لە گەرمیان دەست بەکارکردن دەکەن

■ نەوژین،
پەیام لەتیف - سازان مستەفا

**کاتێک (سەبیحە) بەناچاری و لەبەر بارودۆخی ئەمنی شارەکەی خۆی بەجێهێشت، لە سنوری گەرمیان و قەزای کەلار گیرسانەوە، بەڵام زۆری نەبرد بۆ ئەوەی بە ژیان لەم ناوچەیە رابێت، بەڵکو توانی لەماوەیەکی کەمدا بگەڕێتەوە سەر ئەو پیشەیەی کەلە زێدی خۆیدا ئەنجامی دەدا کە پیشەی ئارایشت و جوانکاریی ژنانە.**

لەگەڵ هاتنی شەپۆلی ئاوارەی عەرەب بۆ سنوری گەرمیان لە ساڵانی دوای توندوتیژی تائیفی و بەتایبەت لە سێ ساڵی رابردوی دوای هاتنی داعش، بەشێکی بەرچاو لەو ئاوارانە بۆ پەیداکردنی بژێویی ژیانیان، تێکەڵ بەکار و کاسبی بون لەو شوێنانەی کۆچیان بۆ کردوە، لەنێویشیاندا ژنان. ژنانی ئاوارە بەتایبەت ئەوانەی کە لە زێدی خۆیان خاوەنی پیشە بون، لێرە جارێکی دیکە دەستیان بەکارکردن کردوەتەوەو پەرەیان پێداوەتەوە.

سەبیحە ئیبراهیم، کە خەڵکی شاری (رومادی) رۆژئاوای عێراقە، یەکێکە لەو ژنانەی کە نزیکەی ٥ ساڵە ئاوارەی گەرمیان بون و بۆ ٤ ساڵ دەچێت لە کەلار ئارایشتگای داناوە.

بۆ (نەوژین) وتی: «من لەزووەوە خەریکی ئەم کارەم، دوای هاتنمان بۆ گەرمیان، جارێکی دیکە دەستم بەم کارە کردەوە لەپێناو دابینکردنی بژێویمان».

وتیشی: «ئێستا بەهۆی گەورەبونی تەمەنمەوە هەندێکجار بیرلەوازهێنان دەکەمەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کەمدەرامەتین و لەخانوی کرێداین وهاوسەرەکەشم زۆربەی کات بێکارە، بۆیە دەبێت بەردەوام کاربکەم».

ئەگەر (سەبیحە) بۆ پیشەکەی دوکان و شوێنکاری تایبەتی دانابێت، ئەوا ژنانی دیکەی ئاوارە هەن کە کارەکانیان لەماڵەکانی خۆیاندا دەکەن.




جینان عەبد، ٣٧ ساڵ، یەکێکە لەو ژنانە. ئەو کە خەڵکی قەزای (فەلوجە) یە، هاوسەرگیری کردوەو خاوەنی ٦ منداڵە، لەئێستادا لە قەزای کەلار گیرساونەتەوە و بەپیشەی بەرگدوری (خەیاتی)یەوە سەرقاڵە.

وتی: «کاتێک ماڵمان لەفەلوجە بو خەیاتیم تەنها بۆ خۆمان دەکرد، بەڵام دوای ئاوارەبونمان وهاتنم بۆ ئێرە، خەیاتی بۆ خەڵکی دەکەم».

وتیشی: «تاڕادەیەک کارەکەم باشەو خەڵکی سەردانم دەکەن و لەگەڵ ئەو کارەی هاوسەرەکەم ئەنجامی دەدات توانیومانە هەرچۆنێک بێت ژیانی خۆمانی پێ دابین بکەین».

کاتێک پرسیاری ئەوەمان لە (جینان) کرد ئایا دەتوانێت جلی کوردی بدورێت؟ ئەو بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: «بەڵێ فێربوم و ئێستا زۆر بەباشی دەزانم جلی کوردی بدورم».

بەشێکی تر لەو ژنە ئاوارانەی کە لەگەرمیان دەستیان بەکار کردوە، باسلەجیاوازی شێوازی ئیشکردنیان لەوێ و لێرە دەکەن.



فاتمە، ناوی خوازراوی یەکێکی ترە لەو ژنانەی کە کاری ئارایشتگا دەکات و خەڵکی پارێزگای دیالەیە.

بۆ (نەوژین) وتی: «لەوێ من لەماڵدا کارمدەکرد، بەڵام لێرە دەبێت دوکان دابنێت و مۆڵەتت هەبێت بۆ ئەوەی کاربکەیت، هەروەها لەروی نرخیشەوە جیاوازیی زۆرە، بۆنمونە من لە دیالە قژم مێش دەکرد بە ٥٠ تا ٦٠ هەزار دینار، بەڵام لێرە بە ١٥ تا ٢٠ هەزار دینارە».

هەمو ئەو ژنانەی ئێمە لێدوانمان لێوەرگرتن، باسی باشی مامەڵەی خەڵکی دەکەن لەگەڵیانداو تاڕادەیەکی زۆر لەهەڵسوکەوت و مامەڵەی هاوڵاتیان رازی بون.

وەک (سەبیحە) وتی: «هەرچەندە کاری ئێرەم لەڕوی داهاتەوە ناگات بەوەی کە لە زێدی خۆم دەمکرد، بەڵام خەڵکی ئێرە زۆرباشەو موشتەریەکانیشم لەکارەکانی من رازین».

(فاتمە)ش دەڵێت: «خەڵکی ئێرە زۆر باشن لەگەڵم دا و وەکو خێزانی خۆمانیان لێهاتوە».

سەبارەت بە رێوشوێنە یاسایی و کارگێڕییەکان بۆ رێگەدان بە ژنانی ئاوارە بۆ کارکردن و دانانی شوێنکار، عومەر محەمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەوەرانی کوردستان، بۆ (نەوژین) وتی: «بەبێ جیاوازی مۆڵەت بەژنان دراوە کەداوایان بۆ کارکردن پێشکەش کردبێت».

وتیشی: «لەبارەی ئەو ژنانەی ئاوارەن و لە نەتەوەی عەرەبن، ئەگەر لێرە نیشتەجێ بن ومۆڵەتی ئاسایشیان هەبێت، ئەوا لەسەندیکا مۆڵەتی کاریان پێ دەدرێت».

جگە لەو ژنانەی کە لە ناو شارەکان نیشتەجێن، ژنانی ئاوارەی نێو کەمپەکانیش لەسنوری گەرمیان هەندێکیان دەستیان بەکار کردوە، ئەویش دوای ئەوەی لە رێگەی رێکخراوەکانەوە خولی راهێنانی پیشەییان بۆ کراوەتەوە.

ڤیان سابیر، رێکخەری پرۆژەکانی رێکخراوی خەڵک بۆ گەشەپێدان، کە چەند خولێکی راهێنانی فێربونی پیشەیان بۆ ژنانی ئاوارە لە کەمپەکان کردوەتەوە لەبابەتی (بەرگدوری، ئارایشتگا و ئیشی دەست)، باسلەوەدەکات کە هەر پاش ئەو خولانە هەندێک لە ژنان دەستیان بەکارکردن کردوە لەنێو خێوەت و کابینەکانیانی خۆیان دا.

---

# لەدەربەندیخان دو هاوسەر کارگەیەکی دروستکردنی نان دەکەنەوە



■ نەوژین، دڵشاد سەید عەلی

**لەدەربەندیخان نانەواخانەیەک کراوەتەوە و سەرجەم کارمەندەکانی ئافرەتن و بەشێوازی کوردەواریی نان دروست دەکەن، خاوەنی کارگەکە دو هاوسەرن کە زۆر دڵخۆشن بەپرۆژەکەیان و دەڵێن: ئێمە یەکەمین کەس بوین کارگەیەکی لەم شێوە دابمەزرێنین.**

(کارگەی نانەواخانەی کوردەواریی)، ناوی ئەو کارگەیەیە کە بۆیەکەمجارە لەقەزای دەربەندیخان دەکرێتەوە، تێدا چەند جۆرێک نانی کوردەواریی دروست دەکەن کە لەئێستادا بە کەمی دروست دەکرێن.

رێزان و مەحمود، هاوسەری یەکترن و لە شارۆچکەی دەربەندیخان بیرۆکەی کارگەیەکی دروستکردنی نانی خۆماڵی کوردەواریی دێت بەخەیاڵیاندا و دوای هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر، پرۆژەکەیان سەرکەوتودەبێت و لە ئێستاشدا ناوبانگێکی تایبەتیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردوە.

ئەو ژن ومێردە جگە لە سودبینی خۆیان، لە کارگەکەیاندا توانیویانە هەلی کار بۆ ١٢ ئافرەتی تری سنورەکە بڕەخسێنن.

رێزان، کەخاوەنی بیرۆکەکەیە، مەحمودی هاوسەری رۆژانە هاوکاریی دەکات لە کارگەکە، بۆ (نەوژین) وتی: «زۆرلخۆشم بە پرۆژەکەم و هەوڵی بەرەوپێشبردنی زیاتری دەدەم و رۆژبەرۆژ داواکاری لەسەر ئەو نانەی دروستی دەکەین زیاد دەبێت».

ئاماژەی بەوەشکرد کە ئەوان جۆرە نانێک دروست دەکەن کە لەئێستادا دروستکردنی لە نانەواخانەکانی تر دەگمەنە و تەنها ئەوان لە قەزاکە دروستی دەکەن و خواستێکی زۆری لەسەر هەیە.

باسیلەوەشکرد ئەو نانەی دروستیدەکەن نانی خۆماڵین و پێکدێت لە: (نانی ساجی کوردەواریی، نانی ساجی جۆ، کەلانە، ناو ساجی، نانی تیری و ... هتد). وتیشی: «خەڵکی زۆر داواکاری لەسەر بەرهەمەکانمان هەیە و ئەوەندە کارەکە غەریب بوەتەوە خەڵک دێت بولامان ئەڵێت ئەو نانەمان پیشان بدە کەدروستی دەکەن بزان چۆن نانێکە».

ئەو کارگەیە وەکو دو هاوسەرەکە باسیدەکەن، سەرەتا بە هەوڵێکی سنوردار دەستی پێکرد، بەڵام ئێستا کارەکەیان گەشەی کردوەو هەم بەرهەمیان زیاد کردوە هەم ستافەکەشیان.

مەحمود، کە هاوکارو هاوسەری رێزانە لە بەڕێوەبردنی نانەواخانەی کوردەواریی، بۆ (نەوژین) وتی: «ئێمە یەکەمین کەس بوین لە دەربەندیخان کارگەیەکی لەمشێوەیەمان دانا، بەدوای ئێمەدا خەڵکیتر چاویان لەئێمە کرد و نانەواخانەی هاوشێوەیان دروستکردوە».

وتیشی: «رۆژانە ٢ بۆ ٣ هەزار نان دروست دەکەین و داواکاریەکی زۆر لەسەر نانەکەمان هەیە».

زۆرجار ژنان بەهۆکاری عەیب و شەرم و هەروەها لەترسی قسەو قسەڵۆکی کۆمەڵگا، خۆیان بەدور دەگرن لەکارکردن، ئەو توانایەی هەیانە لەناخی خۆیاندا دەمرێنن.

بەڵام (رێزان) ئەو بیرۆکەیە رەد دەکاتەوەو پێیوایە کە کارکردن تەنها بۆ پیاوان نیە، بەڵکو پێویستە ئافرەتانیش بێنە دەرەوەو هاوشانی پیاوان دەست بە کار بکەن و متمانەیان بە خۆیان بێت و پشت بە توانای خۆیان ببەستن.

وتیشی: «دەبێت ژنان نەترسن، چونکە کارکردن هیچ عەیب نییە وەک رەواجی پێدەدرێت لەکۆمەڵگادا».

ئەو پەیوەندیە باش و هاوکاریە تەواوەی لەنێوان ئەو دو هاوسەرەدا هەیە، بوەتە هۆیەک کە پرۆژەکەیان زیاتر سەر بگرێت و گەشەی زیاتریش بە کارەکانیان بدەن.

رێزان، باسی لەوەکرد کە ئەو کارگەیەی دروستیان کردوە بە هاوکاری هاوسەرەکەی بوە و لە ئێستاشدا رۆژانە هاوسەرەکەی هاوکارییان دەکات لەبەڕێوەبردنی کارگەکە و دەستخۆشی لەهاوسەرەکەی کرد کە هەمیشە هاوکار و پاڵپشتیەتی.

رەنگە ئەم هاوکاریەی کەلەنێوان دو هاوسەرەکەدا هەیە، وایکردوە ناوبانگی کارگەکە بچێتە دەرەوەی دەربەندیخانیش.

مەحمود، لەوبارەوە وتی: «جگە لە خەڵکی دەربەندیخان، خۆشبەختانە ناوبانگی کارگەکەمان باش رۆشتوە و تەنانەت خەڵکانێکی زۆر لەدەرەوەی دەربەندیخانیشەوە سەردانمان دەکەن و نانمان لێدەکڕن و لەگەڵ خۆیان دەیبەنەوە».

# سێوە... ژنە شوانەکەی کەلار



لەماڵی باوکمەوە هەتا ئێستاش هەر خەریکی شوانیم

■ نەوژین، جوانە جەلیل

**میمکە سێوە، هاوشێوەی ناوەکەی خاوەن دڵێکی گەنجەو پڕپەتی لەتواناو هیوا، بێ گوێدانە گەرمای تاقەت پڕوکێنی ئەم مانگەی هاوین بەدرێژایی رۆژ خەریکی لەوەڕاندنی ئەژەڵەکانیەتی. ئەو لەئێستادا سەرقاڵی پیشەیەکە کە کەمجار ژنان ئەنجامی دەدەن، کە ئەویش شوانکارەییە.**

سێوە عەزیز، کە بە (میمکە سێوە) ناسراوە، دانیشتوی گەڕەکی کەلاری کۆنە لە قەزای کەلار، لەئێستادا بەتەنیا دەژی، ئەو بەهۆی ئەوەی کە هیچ خوێندەوارییەکی نیە و بەوتەی خۆی شارەزای خوێندنەوە و نوسین و بەرواری لەدایکبون و هاوسەرگیری ومردنی هاوسەرەکەی نیە، بەڵام بەپێی لێکدانەوەی خۆی و ئەو روداوانەی کە لە کوردستاندا رویان داوە، لەدایکبوی ساڵی ١٩٤٣ ی یەکێک لەگوندەکانی ناوچەی گەرمیانە.

لەسەردانێکی (نەوژین) دا بۆ ماڵی میمکە سێوە و خستنەڕوی ژیان و گوزەرانی و چۆنێتی کارکردنی رۆژانەی بەپێکەنینەوە بەمجۆرە بۆمان دوا و وتی: «هەر وەبۆنەی قسەکانمۆ نەمگرن من کێشەم نیە گشتیتان بۆ باسەکەم».

ئەو بەهۆی نەزانینی ساڵ و بەروارەوە، سەرگوزەشتەکانی ژیانی بە (کارەساتی ئەنفال و شەری ئێران و عێراق و روخانی رژێمی بەعس و .....هتد) دەبەستێتەوە، هەربۆیە بەمشێوەیە درێژەی بەقسەکردن دا و وتی: «نازانم ساڵی چەن بو، بەڵام چوار پێنج ساڵێ پێش ئەنفال هاتینە کەلار و تائیسە هەر لەیرە ئەژین، لەماڵی باوکمەوە هەتا ئێستاش من هەر خەریکی شوانیم و هیچ کارێکی ترم نەکردوە».

میمکە سێوە باسی لەهاوسەرگیریەکەی کرد و وتی: «دڵنیا نیم بەڵام وابزانم تەمەنم نزیکی ٢٠ ساڵ بو شوم کرد بەپیاوێک و ٧ مناڵم لێ هەیە، پیاوەکەیشم هەر وەک خۆم هیچ کاریتری نەکردوە جگە لەشوانی و لەوەڕاندنی ئاژەڵ».

ئەگەرچی پیشەی شوانی تاڕادەیەک بە پیشەیەکی پیاوانە ناسراوە، بەڵام میمکە سێوە توانیویەتی وەکو پیاوێک کاری شوانی بکات و تا ئێستەش بەردەوامبێت سەرباری هەڵکشانی تەمەنی.

ئەو بە دڵخۆشیەکی زۆرەوە باسی لەکارەکەی کرد و وتی: «جاران وابو خەڵک هەموی خەریکی مەڕ و ماڵات و شوانی بوە، ئەو ماڵانەیش کە زۆر دەوڵەمەن بون هەر مەڕو ماڵاتیان هەبوە و بەخێویان کردوە چونکە کارێکی خۆش بو بۆمان و ئاسودەبوین بەو ژیان و بەوکارە هەرچەندە کارێکی ئاسان نیە».

میمکە سێوە زیاتر قسەی کرد «تا کاتی مردنی پیاوەکەم پیشەی شوانیم وەک کارێ رۆژانەو ئاسایی بوە، بەس ئیسە مناڵەکانم ژنیان هێناوەو شویان کردوە و بەتەنیا ئەژیم بۆیە ئیسە بۆ دابینکردنی بژێوی رۆژانەمە، چونکە هیچ موچەیەکم نیە بێوەژنانەکەشم بڕاوە».

وتیشی: «زستانان بەهۆی سەرماوە ناتوانم زۆر ئاژەڵەکان بوەمۆ دەرۆ، بەڵام مانگەکانیتر و رۆژانیتر لە ٦ بەیانیەوە لەماڵ دەرەچم تا بانگی ئێوارە».

میمکە سێوە، لەئێستا دا لەخانویەکی تایبەت بەخۆی بەتەنیا و نزیک لەکوڕەزا و کچەزاکانی دەژی.

ئەو خاوەنی هەشت سەر ئاژەڵە و رۆژانە رێگەیەکی زۆر دەبڕێت بۆ دەرەوەی شار بەمەبەستی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی. هەرچەند لەئێستادا بەخێوکردنی ئاژەڵ لەشاردا قەدەغەکراوە، بەڵام میمکە (سێوە) بە پێکەنینەوە وتی: «گەر ئاشایسیش بمگرێ من هەر واز لەم شوانیە نایەرم و بەردەوامم، چونکە هەم نانی هالەسەر و هەمیش زۆر حەزم هالێی و ئاسودەم پێی».

---

# ژنانی گەرمیان دەبنە پارێزەر

## بەرپرسی ژوری پارێزەرانی کەلار: لەئەدائی سەرجەم پارێزەرانی ژن رازیم

■ نەوژین، پەیام لەتیف

**کاری پارێزەری کە پێشتر بەکارێکی پیاوانە ناسرابو کەمتر ژنان کە دەرچوی بەشی یاساش بون ئەم کارەیان دەکرد، ئەمەش بۆ قورسی و کێشەو گرفتەکانی ئەو کارە دەگەڕێتەوە، بەڵام لەئێستاداو لەگەرمیان کۆمەڵێک ژن دەستیان داوەتە کاری پارێزەری و بەشێکیشیان چەند ساڵێکە خەریکی ئەم کارەن.**

پارێزەر لەگەڵ ترسا هەرگیز سەرکەوتو نابێت

بەهۆی کارەکەمەوە توشی هیچ هەرەشەو کێشەیەک نەبومەتەوە

کارکردن لەهەمو کەیسێکدا قورسەو بەهەمو پارێزەرێک ناکرێت، بەڵام بەشێک لەو ژنە پارێزەرانە بەبێ گوێدانە هیچ کیشەو ئاستەنگێک کاری خۆیان دەکەن.

سەیران حەبیب، یەکێکە لەو ژنە پارێزەرانەو ماوەی ٦ ساڵە کاردەکات، وتی: «من هەمو جۆرە کەیسێک وەک پارێزەر وەردەگرم و بەهۆی کارەکەمەوە توشی هیچ کێشەیەک نەبوم.»

بەهار عەلی، یەکێکی ترە لەو ژنە پارێزەرانە و ماوەی دو ساڵە کاردەکات.

دەڵێت: «هەمو جۆرە کەیسێک وەردەگرم تەنها لەداوای جنایات نەبێت، چونکە دەسەڵاتەکەم هێشتا راهێنراوە، لەبەرئەوەی بەپێی یاسای پارێزەرایەتی ئەو پارێزەرەی دەسەڵاتەکەی راهێنراو بێت ناتوانێت بەتەنها داوای جنایات وەربگرێت».

وتیشی: «لەم کاتەدا دەتوانین لەگەڵ پارێزەرێکی کارا داوای جنایات وەربگرین».

رونیشیکردەو: «بەهۆی کارەکەمەوە توشی هیچ هەڕەشەو کێشەیەک نەبومەتەوە».

لەکۆی ٧٣ پارێزەر لەژوری پارێزەرانی کەلار، ١٨یان ژنن و زۆربەیان کاری پارێزەری دەکەن.

(لوئەی سەلیم) بەرپرسی پێشوی ژوری پارێزەرانی کەلار، بۆ (نەوژین) وتی: «پارێزەرە ژنەکان سەرجەم ئەو کەیسانەی وەری دەگرن بەپێی تواناو زانیاری تایبەت بەخۆیان دەتوانن چارەسەری تەواوی بکەن، لەوحاڵەتەش دەسەڵاتی وەرگرتنی ئەو دۆسیانەیان نیە ئەوا بەهاوکاری لەگەڵ پارێزەرێکی راوێژکار یان کارا، کێشەکان وەردەگرن و چارەسەری دەکەن».

لەبارەی ئاستی ژنانی پارێزەریشەوە، (لوئەی سەلیم) وتی: «من لە ئەدائی سەرجەم پارێزەران رازیم وهیچ کێشەیەکیان نیە لەوەرگرتنی دۆسیەکاندا.»

بۆ ئەو ژنانەی کێشەیان هەیە بونی پارێزەرێکی ژن وادەکات زیاتر بتوانن کێشەکانیان و ئەو قسانەی لە دڵیاندایە باسی بکەن، بۆ ئەمەش بەشێکیان لەکاتی کێشە پەنا بۆ پارێزەرە ژنەکان دەبەن.

یەکێک لەو ئافرەتانەش کە کێشەی لەگەڵ هاوسەرەکەی هەبوەو پەنای بۆ پارێزەرێکی ژن بردوە، بۆ (نەوژین) وتی: «من بۆیە پارێزەرێکی ژنم هەڵبژاردوە چونکە دەتوانم بەباشی کێشەو گرفتەکانی خۆمی پێ بڵێم و هەروەها ئەویش بەباشی لەمن تێدەگات و گوێم بۆ دەگرێت».

سەیرانی پارێزەریش دەڵێت: «من زیاتر کار لەکەیسی ژنان دەکەم، هەوڵی سەرەکیشم بۆ ئەوە بوە حەقی ژنەکان وەربگرم و نەهێڵم مافەکانیان زەوت بکرێت».

لەبارەی ئەوەی بەشێک لەژنان بەهۆی ترس لەکارەکەو ئەو کێشانەی روبەڕوی دەبنەوە کاری پارێزەری ناکەن، (سەیران حەبیب) دەڵێت: «ئەم کارە پێویست بەترس ناکات وئێستا خەڵک هۆشیاربونەتەوە، ئەمە سەردەمی کۆن نیە، بەڵکو ئێستا تێڕوانینی خەڵک گۆڕاوە».

جەختیشیکردەوە «کاری پارێزەری هیچ پێویست بەترس ناکات».

(بەهار عەلی)ش، بە متمانە بەخۆبونێکەوە وتی: «ئەو ئافرەتانەی کە بەهۆی ترسەوە ناتوانن کاربکەن، پێیان دەڵێم پارێزەر لەگەڵ ترسا هەرگیز سەرکەوتو نابێت.»



# ڕێنواز، تەمەنێکی کەم و ئەزمونێکی زۆر



■ نەوژین، سەرگوڵ خەلیل

**سەرەڕای تەمەنە کەمەکەی، بەڵام (ڕێنواز) وەک کچە شێوەکارێکی چالاک دەرکەوتوەو تا ئێستا بەشداریی چەندین پێشانگای کردوە نەک تەنها لە گەرمیان، بەڵکو لە شارەکانی دەرەوەی گەرمیانیش.**

لەچەند ساڵی ڕابردودا و لەگەڵ کردنەوەی پەیمانگای هونەریی و سەنتەری جیاوازی تایبەت بە پەرەدان بە تواناکانی گەنجان لە سنوری گەرمیان، ڕێژەی کچانی هونەرمەندیش روی لە زیاد بون کردوە، بەشێک لەو کچانە سەرباری کەمی تەمەنیان، بەڵام توانیویانە بەزویی تێکەڵ بەو بوارە بن و پەرە بە توانا هونەریەکانیان بدەن، یەکێک لەو کچانەش، (ڕێنواز نامیق) ە.

ڕێنواز، تەمەنی ١٩ ساڵە و لەدایکبوی شاری کەلارە، سەرەتاکانی هاتنە نێو دنیای هونەری دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغەکانی خوێندنی بنەڕەتی کە ساڵانە لە چالاکیە هونەریەکان (شێوەکاری و شانۆ) بەشداریی کردوە.

وەک لە دیدارێکی (نەوژین) دا ئاماژەی بۆ کرد، خولیاو ئارەزوی بۆ هونەری شێوەکاری زیاتر بوە و بەوەوە نەوەستا کە تەنها ساڵانە بەشداری لە چالاکیە هونەریەکانی قوتابخانەکەی بکات، بۆیە لەدەرەوەی قوتابخانە دەستی بە کارکردن کردوە لەڕێگەی بەشداریکردن لە خولەکانی پێگەیاندنی هونەریی.

وتی: «بۆ ئەو مەبەستەش سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلارم بە گونجاو زانی و لەوێوە توانیم پەرە بە ئاست و توانای فێربونی خۆم بدەم لە هونەری شێوەکاریدا».

یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی کەمی بەشداریی کچان لەگەرمیان لە کاری هونەریی وەک شارەزایان باسیلێوەدەکەن، ئەو ڕێگریانەیە کە لە خێزانەکاندا روبەڕوی دەبنەوە، بەڵام لەلای (ڕێنواز) رەوشەکە نەک هەروەها نەبوە، بەڵکو پێچەوانە بوە.

ئەو باس لە خێزانەکەی دەکات و دەڵێت: «من لە نێو دنیای هونەردا ژیاوم، چونکە باوکم خۆی پەیکەرتاشەو دایکیشم دەسترەنگینیەکی جوان و بەسەلیقەی هەبوە لە کاری دەستیدا، بۆیە ئەوان ڕێنیشاندەری سەرەکی من بون لە بەردەوام بون و باشتر بونم لە کاری هونەری».

ڕێنواز، گەڕایەوە سەرباسی کارە سەرەتاییەکانی و هەنگاوەکانی کاری دەستپێکی و وتی: «یەکەمین پێشانگام بە ئاستێکی سەرکەوتو لە ساڵی ٢٠١٤ کردەوە کە لە سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار لەژێر ناونیشانی (تابلۆکانی بەر لە خەزان) کردمەوە، لەهەمان ساڵدا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری لە بەشی شێوەکاری وەرگیرام و لەوێوە جارێکی تر حەز و ئارەزوی من بۆ کاری شێوەکاری زیاتر بو، ئەمساڵ قۆناغی پێنجەمم لە بەشی وێنەکێشان».

کچە شێوەکارەکە لەو ساڵانەی کاری کردوە بە تابلۆ رەنگینەکانی بەشداری چەندین پێشانگای کردوە لەسەر ئاستی کوردستان کە دیارترینیان جگە لەکەلار، شارەکانی (سلێمانی، دەربەندیخان و کۆیە)یە.

بەردەوام یەکێک لەکێشە گەورەکانی هونەر لە کوردستان بەگشتی ئەوەبوە کە زۆر بەکەمی دەبێتە سەرچاوەی بژێویی بۆ هونەرمەند، بۆیە هونەرمەند ناچارە بۆ بژێویی خۆی و بەردەوامبون لەکارەکانی دا، کاری دیکە بکات. وادیارە چارەنوسی (ڕێنواز)یش وەکو هونەرمەندانی دیکەیە لەو روەوە، چونکە ئەو لەپاڵ کاری هونەریی، لە یەکێک لە بازارەکانی شاری کەلار دا کاردەکات.

لەبارەی کارەکەیەوە بۆ (نەوژین) وتی: «ئەم کارەم نەبوەتە ڕێگر لەبەردەم کاری هونەریمدا، بەڵکو زیاتر هانی داوم بۆ بەردەوام بون لە کاری هونەری».

حاڵەتێکی دڵخۆشکەری کایەی هونەر لەگەرمیان ئەوەیە کە رۆژ دوای رۆژ ژمارەی کچانی هونەرمەند تیایدا زیاد دەکات، لەوبارەوە (ڕێنواز) دڵخۆشیی خۆی دەردەبڕێت.

وتی: «هەمو ئەمانە دڵخۆشیەکی تەواوی بە من بەخشیوە لەماوەی ئەمساڵانەی کارکردنم لە کاری هونەری بەتایبەت ئەم ساڵانەی کۆتایی کە ژمارەیەکی بەچاوی ئافرەت تێکەڵ بە کاری هونەری بون و تا دێت ژمارەیان زیاتر دەبێت، ئەمەش مایەی دڵخۆشیە کە ژنانیش شانبەشانی پیاوان دەتوانن بەشدار بن لە کارە هونەریەکان».

وتیشی: «دەمەوێت منیش شوێن پەنجەی خۆم لە هونەری شێوەکاریدا بنەخشێنم، ئەویش لە ڕێگەی هەبونی خوێندکاری تایبەت بە خۆم و بەشداری کردنی پێشانگاکان لەسەر ئاستی هەرێم و دەرەوەی هەرێمیش».

جەختی لەوەشکردەوە کچان بۆ ئەوەی پەرە بەتواناکانی خۆیان بدەن، پێویستییان بە خۆماندوکردن و کۆشش و قوربانیدان هەیە.

لەوبارەوە وتی: «هیچ شتێک بەبێ ماندوبونێکی زۆر، ئەنجامێکی زۆر باشی نابێت، بۆیە هەمو سەرکەوتنێک پێویستی بە رەنج و فیداکاریە».





# ژنە نوسەرەکەی دۆستی کورد

■ نەوژین

**ئەگەر بڕیاربێت ریزبەندیەک بۆ باشترین نوسەرانی ژنی عەرەب بکرێت لە مێژودا، ئەوا بێگومان (ئەحلام مستەغانمی) دەکەوێتە سەروی لیستەکەوە، ئەویش بەهۆی ئەو کاریگەریی و داهێنانە بەرچاوەی کە لە ئەدەب و بەتایبەتی رۆمان دا کردویەتی.**

ئەگەرچی زۆرینەی نوسەرە دیارەکانی جیهان و عەرەبیش لە رەگەزی نێرن، بەڵام ژمارەیەک قەڵەمی ژن، توانیویانە لەو مەیدانەدا بەتوانایی و کاریگەریی خۆیان بسەلمێنن، ئەحلام یەکێکە لەو ژنانە، کەتائێستاش رۆمانەکانی وەکو شاکار لە ئەدەبی عەرەبی لێی دەڕوانرێت و چەندین خەڵاتی بەدەستهێناوەو لە ریزبەندی پڕ فرۆشترین رۆمانەکانیشە.

ئەم ژنە نوسەرە، بەزۆریی بە رۆمانی (یادگەی جەستە = ذاكره الجسد) ناسراوە، کەکاتی خۆی وەکو بومەلەرزە دونیای ئەدەبی عەرەبی لەراندەوەو تائێستاش وەکو یەکێک لە باشترین ١٠٠ رۆمانەکانی عەرەب هەژمار دەکرێت. بەدوای ئەم رۆمانەشداو وەکو تەواوکاری چیرۆکەکە، دو رۆمانی دیکەی بڵاو کردەوە بەناوەکانی (فوضى حواس = پشێویی هەستەکان) و (عابر سرير = ڕێبواری نوێنگە)، کە هەرسێکیان پێکەوە بە سیانە «ثلاثيه» ناودەبرێن، هاوشێوەی سیانییە بەناوبانگەکەی رۆماننوسی ناسراوی میسر (نەجیب مەحفوز).

بەگەڕانەوە بۆ سەرەتاکان، ئەم ژنە نوسەرە لەساڵی ١٩٤٧ لە جەزائیر لەدایکبوە، بۆماوەیەک پێشکەشکاری بەرنامەیەکی شیعریی بوە لە رادیۆی وڵاتەکەی کە جەماوەرێکی زۆری هەبوە، پاشان گەشتی فەرەنسای کردوەو لەوێ دەستی بەخوێندن کردوەو بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری کۆمەڵناسیی لە زانکۆی (سۆربۆن) بەدەست هێناوە.

ئەم ژنە نوسەرە، پێش بڵاوبونەوەی رۆمانەکەی (یادگەی جەستە)، چەند کتێبێکی دیکەی شیعریی و ئەدەبی بڵاوکردبویەوە، بەڵام هیچیان بەقەد ئەو رۆمانە نەیان ناساند، چونکە ئەو رۆمانە چ لەروی تەکنیکی گێڕانەوەو چ لە روی پەیام و ناوەڕۆکیشەوە، رۆمانێکی پڕ و جوان و داهێنانێکی ناوازە بو، هەر ئەمەشە وایکرد کە بۆ چەندین زومان وەربگێڕدرێت و پاشانیش کرا بە زنجیرە تەلەفزیۆنییەک.

«خۆشحاڵیی خۆی بە بڵاوکردنەوەی رۆمانەکەی بە کوردیی دەردەبڕێت»

شاعیری ناسراوی عەرەب، نزار قەبانی، لەبارەی رۆمانەکانی (ئەحلام)ەوە دەڵێت: «رۆمانەکانیان گێژیان کردم، ئەمە لەکاتێکدایە کە رۆمان زۆر کەم گێژم دەکات».

ئەم ژنە نوسەرە، بەوە ناسراوە کە نوسەرێکی دۆست و نزیکە لە دۆزی کوردەوە، هەربۆیە بۆنەو یادەکانیش لەدەست نادات بۆ پیرۆزبایی کردن لە گەلی کوردستان.

لە نامەیەکی پیرۆزبایی دا بەبۆنەی جەژنی نەورۆزی ساڵی ٢٧١٤ی کوردیەوە، نوسیویەتی: «بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە، گەرمترین پیرۆزباییاتان لێدەکەم، بەوهیوای ئەم ژنە بێتە مایەی زیاتری گەشانەوەتان».

ئەحلام مستەغانمی، لە نامەیەکدا بۆ وەرگێڕی رۆمانەکەی بۆ کوردیی (حەمەساڵەح حەمە ئەمین)، خۆشحاڵیی بێپایانی خۆی بە بڵاوکردنەوەی رۆمانەکەی بە زمانی کوردیی دەردەبڕێت و بە یەکێک لە ساتە خۆش و کاریگەرەکان وەسفی دەکات.

لەئێستادا ئەم ژنە لەنێوان شارەکانی دوبەی و بەیروت ژیان دەکات و بەنوسینی بابەت و رۆمان و شیعرەوە سەرقاڵە، چونکە ئەو ئەگەرچی زۆرتر وەکو رۆماننوس ناوبانگی دەرکردوە، بەڵام خاوەنی چەندین تێکستی شیعرییەو هەروەک خۆیشی وەکو شاعیرێک دەناسێت.



# ژنان لە میرات بێبەش دەکرێن



■ نەوژین، پەیام لەتیف

**بەهۆی کلتورو بەعەیبە زانینی کۆمەڵگاوە بەشێکی زۆری ژنان لەکاتی بێبەشکردنیان لەمیراتی سکاڵا تۆمارناکەن، لەکاتێکدا میراتی حەقێکی شەرعی و یاسایی ژنانە و لەکاتی دابەشکردنیدا دەبێت بەرکەوتەی خۆیان پێ بدرێت.**

لەدوای مردنی باوک بەپێی شەرع ویاسا میراتی لەنێوان منداڵەکانیدا دابەشدەکرێت، بەڵام بێبەشکردنی ژنان لە میراتی دیاردەیەکی باوەو خودی ژنانیش بەزۆری لەکاتی بێبەشکردنیان بێدەنگ دەبن.

(لەولاو) یەکێکە لەو ژنانەی لەمیراتی بێبەشکراوە. لەوبارەوە بۆ (نەوژین) وتی: «لەدوای مردنی باوک ودایکم براکەم ئەو موڵکانەی باوکم لەدوای خۆی بەجێیهێشت هەموی بۆخۆی برد بەبێ ئەوەی هیچ بەشێکی ئێمە بدات».

لە رابردودا بەبێ گوێدانە ئەوەی ژن حەقی خۆیەتی میراتی پێ بدرێت لەو مافە بێبەشکراوە هەندێکجار خودی دایک هۆکاری ئەم بێبەشکردنەبوە.

حەسیبە، کەباوکی ماوەی ١٠ ساڵە کۆچی دوای کردوەو موڵکێکی زۆری لەدوای خۆی جێهێشتوە، دەڵێت: «لەدوای نەمانی باوکم، دایکم هەمو میراتێکەی دابەکورەکانی و ئێمەی لەو مافە بێبەشکرد، ئێمەش بەهۆی ئەوەی نەمان ئەتوانی قسە لەگەڵ دایک و براکانمان نەکەین بێدەنگیمان هەڵبژارد»

هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لەژنان بەهەر بیانویەک بێت لەمیراتی بێبەشکراون، بەڵام لە بە دواداچونێکی (نەوژین) لە ناو دادگای باری کەسێتی ودادگاکانی لێکۆڵینەوەی کەلار، بۆمان دەرکەوت کە ژمارەی ئەو ژنانەی لە میراتی سکاڵایان کردوە لە پەنجەکانی دەست تێپەر ناکەن و هیچ ژنێکمان دەس نەکەوت لەسەر میراتی سکاڵای کردبێت،بەڵام ئەوەمان بۆ رون بوەو کە بەشێک ژنان لە دادگاکانی مەدەنی داوا دەکەنەوەو لەو رێگەیەوە داوای بەشی خۆیان دەکەن و رێگا نادەن کە بێبەش بکرێن، ئەمەش بۆ خۆی جۆرێکە لەسکاڵا لە بێ بەشکردنی میراتی.

نمونەی ئەم جۆر داوایەش (چرۆ و سروە)ن، کە ناوی خوازراوی دوخوشکن بۆ ئەوەی لەمیراتی بێبەش نەکرێن پەنایان بۆ دادگای مەدەنی بردوە.

(چرۆ) بەمجۆرە چیرۆکی خۆیانی بۆ (نەوژین) باسکرد: «دوای ئەوەی باپیرم کۆچی دوایکرد زەویەکی لە دوای خۆی بەجێهێشت، براکانم زۆر هەوڵیان دا زەویەکە بفرۆشن بەبێ ئەوەی بەشی ئێمەی لێبدەن، بەڵام بەهۆی ئەوەی زەویەکە تاپۆ بو بۆیە هەرچەندیان کرد نەیانتوانی بەبێ رەزامەندی ئێمە بیفرۆشن ونەشیان دەویست بەشی ئێمەی لێبدەن، بۆیە ئێمەش پەنامان بردە بەر دادگا دوای تەواوکردنی رێوشوێنە یاساییەکان زەویەکە بەرەزامەندی ئێمە فرۆشرا، ئێمەش بەپێی ئەوەی لە یاسادا دانراوە بەشی خۆمانمان لە زەویەکە وەرگرت».

بەڵام هەمو ژنانی تر ناتوانن وەک ئەم دوخوشکە داوا پێشکەش بکەن یا سکاڵا بکەن لەسەر بێبەشکردنیان لەمیراتی بەهۆی ئەوکلتورەی کە زاڵە بەسەریاندا.

لەبارەی سکاڵا تۆمارکردنەوە لەسەر براکەی، (لەولاو) دەڵێت: «من لەبەر موڵک و ماڵ ئامادە نیم سکاڵا لەسەر براکەم تۆماربکەم، چونکە خەڵک قسەدەکەن دەڵێن لەبەر پارە شکاتی لەبراکەی کردوە، هەرچەندە من لەوکاتەدا پێویستم بەپارە هەبوە، بەڵام هەر سکاڵام نەکردوە».

لەبارەی سکاڵا تۆمارنەکردنی ژنان و کچانەوە، پارێزەر (نەشاد عومەر)، بۆ (نەوژین) وتی: «بەهیچ جۆرێک یاسا ژنی بێ بەشنەکردوە لە میرات جگە لەو دەقەی کە کچ نیوەی کوڕ دەبات، ئەوەی لە دەرەوەی دادگاکان دەوترێت ئەوەیە کە کچان و ژنان خۆیان نایەنە دادگا و خۆیان بە هۆی بارودۆخی کۆمەڵگاوە ئامادە نین سکاڵا بکەن».

وتیشی: «شتێک نییە لە دادگا یان فەرمانگەکانی تر کە ئاسانکاری بۆ بێبەشکردنی ژن و کچ بکات، بەڵکو ئەوەی هەیە کە کچ خۆی ناتوانێت سکاڵا بکات یان رەزامەند دەبێت بەوەی بەشی نەدرێت و ئەمەش نابێت بڵێت یاسا مافی پێ نەدام ئەکرێت بڵێت کۆمەڵگە نەیهێشت داوای مافی خۆم بکەم».

زۆرجاربەشێکی زۆر لەو موڵکانەی لە دوای کەسی کۆچکردوەو بەجێ دەمێنێت تاپۆ نییەو یان بۆ نمونە ئۆتۆمبێلەو بە ناوی کەسی کۆچکردوە نییە.

پارێزەر(نەشاد عومەر) لەمبارەوە وتی: «ئەمە کێشەیەکی ئیداری و یاسایەو بە یاسا رێکنەخراوە، بۆیە زۆرجار و لە واقعدا رویداوە پیاوان و کوڕان دەچن لە دەرەوەی دادگا ئەم ماڵانە بە بێ رەزامەندی کچ یان ژن دەفرۆشن و بۆ ئەو کرین و فرۆشتنەش پەنا نابەنە بەر فەرمانگە رەسمیەکان و لەم روەوە ژن و کچ بێ بەش دەبن، چونکە ئەو ماڵ و موڵکە بە دەس پیاوەوەیە، بەڵام لەم حاڵەتەش ژن و کچ گەر خۆیان بیانەوێت دەتوانن پەنا ببەنە بەر دادگاکان و سکاڵا بکەن».

نەبونی هۆشیاری ئاینی لای ژنان ونەزانینی ئەوەی میرات حەقی شەرعی خۆیانە وای کردوە پیاوان زیاتر ژنان بێبەش بکەن.

مامۆستا سەباح محەمەد، پێشنوێژو وتارخوێن، لەم بارەوە بۆ (نەوژین) دەڵێت: «داواکارم ژنان هۆشیار بینەوەو لەکاتی بێبەشکردنیان لەمیراتی بەو پێیەی حەقی شەرعی خۆیانە، بۆیە دەتوانن سکاڵا بکەن».

هەروەها وتیشی: «ئەو کەسانەی حەقی ژنان دەخۆن گوناهبار دەبن، چونکە ژنانیش وەک پیاوان پێوستیان بەو میراتیە هەیە».

لەبارەی ئەوەی ئایە لەهەمو حاڵەتەکاندا کچ نیوەی کوڕی بەردەکەوێت؟

م.سەباح وتی: «لەهەمو حاڵەتەکاندا کچ نیوەی کوڕی بەرناکەوێت، لەهەندێ حاڵەتدا وەک یەکیان بەردەکەوێت بەهیچ جۆرێک دین حەقی ئافرەتی نەخواردوە».

هەندێکی تر لەژنان بەویستی خۆیان دەستبەرداری ئەو بەشە میراتییە بون کە بەریان کەوتوە و لەبەر یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەیان ئەو بەشە میراتەیان وەرنەگرتوە.

وەک (ئاسکە) وتی: «بەهۆی ئەوەی ئێمە یەکێک لەبراکانم هەژاربوە بۆیە ئەو خانوەی ماڵی باوکمان کەمابو ئێمە لەحەقی خۆمان دامان بەو برایەمان، چونکە هەمومان هاوسەرگیریمان کردبو پێویستمان پێی نەبو».

---

# مێردەکەی ناپاکیی لەگەڵ کردوەو کەچی ئەم سەرگەردان بوە

■ نەوژین، ژینۆ خەلیل*

**لەمیانەی بەدواداچون و کاری رۆژنامەماندا لەرێگەی تیمەکانمانەوە، گوێبیستی زۆر چیرۆک و بەسەرهاتی زوڵم و ستەم بەرامبەر بە ژنان دەبین، دەمەوێت هەندێک لەو چیرۆکانە بۆ ئێوە بگوازمەوە، نەک بۆ ئەوەی ئێوەش لەگەڵ ئێمەدا خەم بخۆن، بەڵکو بۆ ئەوەی رادەی ئەو ستەم و زوڵمە بزانن کەلەکۆمەڵگەدا بەرامبەر بە ژنان دەکرێت.**

ئەو چیرۆکەی ئەمجارە باسیی دەکەین، هی ژنێکە کە لەسەر ناپاکیی «خیانەت»، ژیانی تێکچوە. کەدەڵێم ناپاکیی وانەزانن کە ژنەکە ناپاکیی کردبێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە، مێردەکەی ناپاکیی کردوەو کەچی ئەم بوەتە قوربانی.

چیرۆکی (نەسرین)، لێرەبەدوا لەسەر زاری خۆی دەگێرینەوە بەهەندێک دەستکاریی بۆ پاراستنی نهێنی ناو و کەیسەکەی.

ئەم ژنە دانیشتوی گەرمیانە، هاوسەرگیریی کردوەو خاوەنی (٣) منداڵە، لەقاتی سەرەوەی ماڵی باوکی پیاوەکەی ژیاون. سەرەتای مەرگەساتی ژیانی بەمشێوەیە دەگێڕێتەوە «رۆژێک مێردەکەم هاتەوە ماڵ و تەلەفۆنەکەی بەگوێوە بو هەر قسەی دەکرد، منیش وتم ئەوە لەگەڵ کێ قسەدەکەی؟ وتی: لەگەڵ خۆشەویستەکەم قسە دەکەم وەرە با رەسمێکت بگرم و بۆی بنێرم پێیخۆشە بتبینێت. منیش وتم باشە تۆ بۆ واز لەم کارانە ناهێنی خاوەنی سێ منداڵی تا کەی بە خۆتدا ناچیتەوە؟».

بەردەوام بو لەسەر گێڕانەوەکەی «ئیتر بو بە دەنگە دەنگمان و مێردەکەم کەوتە لێدانم و بە شەقو زلە هەمو گیانمی شین و مۆر کردەوەو پڕ دەم و لوتم ببو لە خوێن، منداڵەکانیشم دەیانبینی باوکیان لە من دەدات هاتو هاواریان نابوەوە، کاتێک خەسوم گوێی لە دەنگمان بو هاتەسەرەوەو لەبری سەرکۆنەکردنی کوڕەکەی، کەچی هەرچی قسەی ناشرین هەبو بەدەمی دا هات بەرامبەر بە من، بە مێردەکەشمی وت ئەمە کەی ژنە چەندینجار پێت بڵێم تەڵاقی بدە، دەبێت ئەمجارە تەڵاقی بدەی».

باسلەوەدەکات هەر لە سەرەتاوە خەسوی رازی نەبوە هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕەکەی دا بکات، چونکە ویستویەتی خزمێکی خۆی بۆ بهێنێت.

وتیشی: ماوەی چوار ساڵە مێردەکەم پەیوەندی لەگەڵ خزمێکی دا هەیە، دایکیشی ئاگاداری ئەم پەیوەندیەیەو هیچ ناڵێت.

باسیلەوەشکرد مێردەکەی هەرچی ئیشی دەکرد هەمو پارەکانی دەدایە کارتی مۆبایل و دەینارد بۆ «خۆشەویستەکەی»، هەتا پارەی پێنەدەما دواتر دەچو لەدوکانەکان بە قەرز دەیکڕی و خاوەن قەرز دەهاتە سەر ماڵیان بۆ پارە.

وتیشی: «منداڵەکانم لە برسا دەگریان پارەم پێنەدەبو شتێکیان بۆ بکڕم، کاتێک دەچوم بۆ ماڵی نەنکم هەرجارێک نەنکم پێنج هەزاری دەدامێ و شتم بۆیان دەکڕی».

نەسرینی بێچارە بەردەوام بو لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی و باسیلەوەکرد لەپاش ئەو روداوەوە پیاوەکەی دەریکردوە لەماڵ و منداڵەکانی لایخۆی گلداوەتەوە، ئەویش باوکی لەژیاندا نەماوەو دایکیشی نەخۆشە، سەرباری ئەوەی چەند برایەکیشی هەیە، کەچی لێیان نەپرسیوەتەوەو بەناچاری ئێستا لەماڵی خزمێکیێتی.

ئەوەشی وت کە ماڵی خزمەکەی رازیی نەبون بەوەی منداڵەکانی لەگەڵ دا بێت، بۆیە ئێستا بەناچاری منداڵەکانی لەلای مێردەکەی جێهێشتوە.

بە قوڵپی گریانەوە وتی: «شەو و ڕۆژ لە دوری منداڵەکانم خەو لە چاوم حەرامە ئێستا نازانم چی دەکەن؟ چی دەخۆن؟ کەی دەخەون؟ وا خەریکە دڵم پارچە پارچە دەبێت لە دورییان».

وتیشی: «جارجارە بە دزی خزمەکەمانەوە دەچم منداڵەکانم لە ماڵی دراوسێکەمان دەبینم، چونکە ئەو ناهێڵێت تەنانەت بچمە دادگاو سکاڵا تۆماربکەم، چونکە دەڵێت عەیبە نابێت کەس بزانێت تەڵاقدراوی تەنانەت ناهێڵێت بچمە بەر دەرگاش هەر لە ماڵەوە وەکو بەندکراوێک وام».

ئەو ژنە، بە گریانەوە کۆتایی چیرۆکەکەی بەمشێوەیە هۆنیەوە «هەر لە کاتی لە دایکبونمەوە تاوەکو ئێستا هیچ خۆشیەکم لە ژیان نەبینیوە، بێ دایکو باوک لە ژێر چەپۆکی براکانم گەورەبوم، هەر لە منداڵییەوە تا کاتێک هاوسەرگیریم کرد شەو و رۆژ خزمەتکاری دایکە نەخۆشەکەم و براکانم بوم، کە هاوسەرگیریم کرد وتم ئۆخەی ئیتر لە ماڵی خۆم و لەگەڵ مێردم دەحەسێمەوە، بەڵام ١٠ رۆژی نەخایاند مێردەکەم بو بە درندە، ئێستاش تەڵاقدراوم و منداڵەکانم لێدورخراوەتەوەو وەکو بەندیی وام لەنێو دیوارەکانی خانویەکدا».

بەخەمبارییەکی قوڵەوە وتی: «باشە پێم ناڵێی ئەمە چ جۆرە ژیانێکە؟ هەمیشە دەڵێم خۆزگە هەرچیەک دەبوم بەس ژن نەبومایە، چونکە لەم وڵاتە تاکە شتێک بێبایەخ بێتو حسابی بۆ نەکرێت ژنە».



* ئەندامی تیمی رێکخراوی وادی لەگەرمیان

# گیروگرفتەکانی ژنان لە گەرمیاندا



> پێویستە ژنان بخزێنرێنە ناو ئەو کارانەی کە تایبەت کراون بە پیاوان

■ جوانە جەلیل

**کێشە و گیروگرفتەکانی ژنان تایبەت نیە بە ناوچە و سنورێکی جوگرافی دیاریی کراوەوە، لەدوای نەمان و توانەوەی کۆمەڵگەی سروشتی (دایک-ژن) بەشێوەیەکی گشتی کێشەو گرفتەکانی ژنان هاتۆتە بون و هەتاوەکو ئەمرۆش بەردەوامی هەبوەو بەچەندین شیوازی جۆراوجۆر ژنان چەوسێنراونەتەوەو ئازادییان بەرتەسک کراوەتەوە.**

لەهەرێمی کوردستان و گەرمیان بەتایبەتی ئەو گرفتانە بەڕونی هەستی پێدەکرێت، ئەگەرچی بەشیک لەژنان لەنێو کایە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکاندا دەبینرێ، بەڵام بەهۆی ئەو دابونەریت و ئەو فکرە باوکسالاری و نێرسالارییەی کەبەنێو سەرجەم پایەکانی ژیانی ژناندا بڵاوبۆتەوە، نەتوانراوە وەکپێویست پێگەو کارکردنی ژنان پەرەی پێ بدرێت یاخود ریگەخۆشکەربێ بۆ کاڵکردنەوەی گرفتەکانی ژنانی ناوچەکە.

گرفتەکانی ژنان لەگەرمیان زۆرن، ئەگەرچی بەشێکی پەیوەستە بەخودی ژنان خۆیانەوە کەبێ ئیرادەو کەم توانا کراون لەپێناوهەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیان، بەڵام بەشێکی زیاتری بەندە بە وشیارکردنەوەی زیاتری ناوچەکە بۆناسینی خودی خۆیان و هاوکاریکردنی یەکتر لەپێناو کەمکردنەوەی کێشەکانیان و هەوڵدان بۆ نەهێشتنی جیاوازی رەگەزی.

لەو کێشانەش: (کوشتنی ئازادی ژن، هاوسەرگیری پێش ١٨ساڵ کەئەنجامی زۆرینەیان جیابونەوەیە، بەزۆر بەشودانی کچان، رێگەنەدان بەکارکردن، زۆربونی ریژەی کچانی قەیرەو روبەروبونەوەی تانەو تەشەری کۆمەڵگا، دەرکردنی کچان لەخوێندن بەهۆی هاوسەرگیرییەوە، نەبونی کافێ یاخود قاوەخانەیەکی تایبەت بەژنان، نەبون یاخود کەمی دوکانداری ژن، نەبونی جێگەیەکی وەرزشی تایبەت بەژنان وەک مەلەوانگەو هۆڵی لەشجوانی و یاریەکانی دیکە، رێگەنەدان بەخوێندنی کچان و درێژەدان بەخوێندن لەشار و شارۆچکەکانی تر...هتد).

ئەمانەو چەندین کێشەو ئاریشەی تر روبەڕوی ژنانی گەرمیان بوەتەوە و جگە لەپەروەردەکردنی کچان و ژنان بەشێوەیەکی ناتەندروست، نەبونی ئابوریەکی سەربەخۆ و کێشەو ململانێی سیاسی و خراپی دۆخی ئابوری و زۆربونی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی ناوخۆ، ئەمەش وایکردوە کەمتمانەکردن بە رێکخراو و کۆڕو کۆبونەوەکانی تایبەت بەژنان بکەوێتە ژێر پرسیارەوە.

چارەسەرکردنی بەشێک لەو کێشانە پەیوەستە بەلایەنی پەروەردەیی لەخوێندنگا و زانکۆکاندا، تازیاتر گرنگی بەلایەنی پەروەردەیی و فکری بدرێت لەنێو کتێب و وانەکانی خوێندنگا ئەوەندە تاکەکانی کۆمەڵگەش زیاتر وشیار دەبنەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا خراپی باری ئابوریی، رێژەی تاوانە کۆمەڵایەتیەکانی زیاتر کردوە، بۆیە متمانەی خێزانەکانیش کەمتر بوەتەوە بەدەوروبەرو کۆمەڵگاو هەوڵ دەدەن کچەکانیان لەتەمەنێکی کەمدا بەشو بدەن، ئەمەش دواجار کێشەی زیاتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لەسەر حکومەتیش ئەوە دەڵێم کەپێویستە ئاورێک لەگوزەران و ژیانی هاوڵاتیان بداتەوە بۆئەوەی چیتر هەژاری نەبێتە مۆتەکەی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگا. هەروەها لەسەر وەزارەتی رۆشنبیری و وەرزش و لاوان پێویستە کەگرنگی زیاتر بەخول و دەورەی هاوینان بدەن و ئاسانکاری زیاتربکەن بۆ ئەو کچ و ژنانە بۆئەوەی زیاتر رو لەبوارە جیاجیاکان و بوارەکانی وەرزش بکەن.

سەنتەر و ناوەندە ناحکومیەکانیش، لەگەڵ کردنەوەی خولی خەیاتی و دورومان کە زیاتر ئەو کارانە ژنان پەیوەست دەکا بەماڵەوە، هاوکات پێویستە گرنگی زیاتربە خولە جیاوازەکان بدەن ژنان و کچانیش بخزێنرێنە ناو ئەو کارانەی کە لەکۆمەڵگادا تایبەت کراون بە پیاوان وەک (شۆفێری، نانەواخانە، سەرتاشخانە رێستورانت و کافێ و کافتریا و ... هتد).

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بایەخی زیاتر بە پەروەردەی خێزانی بدرێت و ئەو بۆچونە نێرسالارییەی کە هەیە گۆڕانی بەسەردا بێ. بۆئەوەی چیتر کچان و ژنانی ئێمە نەبنە قوربانی دابونەریت و کۆمەڵگایەکی دیموکرات و یەکسان و ئازاد، بۆ سەرجەم چین و توێژەکان فەراهەم بکرێت.





# خوێندنەوەیەک بۆ یاسای بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی

■ پارێزەر: ژیلا تۆفیق

**هەمومان بیستومانە و رەنگە کۆکبین لەسەریشی کە دەوترێت لە ئاشتی ماڵەوە بۆ ئاشتی کومەڵگا، یان لەخێزانێکی سەرکەوتو بۆ کۆمەڵگایەکی سەرکەوتو، بەڵام بونی کێشە لەخێزاندا و چۆنیەتی چارەسەرکردنی جێگەی باسکردنە کە بەتێگەیشتن و قسەکردن چارەسەربکرێت نەک بە توندوتیژی.**

توندوتیژی خێزانی یەکێکە لەو دیاردە هەرە کۆنانەی کە لەگەڵ پەیدابونی یەکەم خێزان لەسەر روی زەوی دروست بوە، ئەم راستیەش لەبەسەرهاتی دو کوڕەکەی (ئادەم) دا دەردەکەویت، کاتیک قابیل براکەی (واتا هابیل) دەکوژێت.

توندوتیژی خێزانی لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا بە رێژەی جیاواز بونی هەیە، تەنانەت لە کۆمەڵگایەکیشدا رێژەکە جیاوازە لە جێگایەک بۆ جێگایەکی تر. لەبابەتی توندوتیژی خێزانی دا کاتیش رۆڵی هەیە، هەندێک حاڵەتی توندوتیژی بەپێی کات کەمی کردوە یان نەماوە بەهۆی وشیاری ئەندامانی خێزان و کۆمەڵگا، وەک: ژنبەژن و گەورە بەبچوک.

بەگشتی هۆکاری توندوتیژی کەمی ئاستی وشیاری تاکەکانی خێزان و لایەنی ئابوری و ئاینیە، هەروەک ژینگەی کۆمەڵایەتییش رۆڵی هەیە کەوا دەکات هەندێک کەس توندوتیژ بن.

لەکوردستان بۆ بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانیی، یاسای ژمارە ٨ی ساڵی ٢٠١١ لەلایەن پارلەمانی کوردستانەوە دەرکراوە. کەلەم یاسایەدا، سنور و جۆر و شێوازەکانی توندوتیژی و هەروەها سزاو باجی ئەنجامدانی توندوتیژیی رون کراوەتەوە. لەم وتارەدا، هەوڵ دەدەین هەندێک بنەماو خاڵی گرنگی یاساکە بخەینەرو و شیبکەینەوە.

لە مادەی یەکەم بەشی ٣ی یاساکەدا، توندوتیژی خێزانی وەها پێناسە دەکات «توندوتیژی خێزانی هەموکردارێک یان وتەیەک یان هەڕەشەکردن کە لەسەر بنچینەی جۆری کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی پەیوەندیە خێزانیەکان کەبنیات نراوە لەسەربنچینەی هاوسەرگیری وخزمایەتی تاکو پلە چوار و ئەوەی بەیاسا خراوەتە پاڵ خێزان کە دەشێت زیان بگەیەنێت لەروی جەستەیی و سێکسی و دەرونی و داماڵینی ماف و ئازادیەکان».

لە مادەی دواتری ئەم بەشەدا، جۆری توندوتیژییەکان بەمشێوەیەی لایخوارەوە رونکراوەتەوە:

١. زۆرلێکردن لەهاوسەرگیریی.
٢. هاوسەرگیری ژنبەژن و منداڵ بەشودان.
٣. بەشودان لەجیاتی خوێن.
٤. دەستلێکبەردانی بەزۆ.
٥. پچڕاندنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی.
٦. مێرد بەزۆر خێزانی خۆی ناچار بکات کاری بەدڕەوشتی بکات.
٧. خەتەنەکردنی مێینە.
٨. ناچارکردنی تاکەکانی خێزان بۆ وازهێنان لە فەرمانبەرێتی یا بەناچاری واز لەکارەکەی بێنێت.
٩. ناچارکردنی منداڵ بۆ کارکردن وسواڵکردن و وازهێنان لەخوێندن.
١٠. خۆکوشتن لە ئەنجامی توندوتیژی خێزانی.
١١. لەباربردن لە ئەنجامی توندوتیژی خێزانی.
١٢. لێدانی تاکەکانی خێزان ومناڵەکان بەهەر بیانویەک بێت.
١٣. سوکایەتی کردن و جنێودان و جنێودان بەکەسوکار و نیشاندانی بەکەم سەیرکردنی وئازاردانی وئەنجامدانی پاڵەپەستۆی دەرونی لەسەری و پێشێلکردنی مافەکانی و بەزۆر سەرجێیکردنی هاوسەر.

ئەم جۆرانەی توندوتیژیی کەباسکراون، جگە لەوەی کەسی قوربانی دەتوانێت سکاڵایان لەبارەوە تۆمار بکات، هاوکات یاساکە رێگەشی داوە کە کەسانی دیکەش بە هەواڵدان بە دادگا یان بە داواکاری گشتی و پۆلیس، لە بونی دۆسیەو حاڵەتی توندوتیژی ئاگاداریان بکاتەوە، هەروەک ئەو کەسانەشی کەلەبواری تەندروستی و پەروەردە و بنکە فەرمیەکان فەرمانبەرن و کاردەکەن، بەهەمانشێوە لەکاتی بەدیکردنی حاڵەتێکی توندوتیژی، دەتوانن دادگاو پۆلیس و داواکاری گشتیی ئاگادار بکەنەوە.

لەروی رێکاری دادگاییکردنیشەوە، وەک یاساکە ئاماژەی پێداوە، دادگایەکی تایبەتمەند بۆ دۆسیەکانی توندوتیژی خێزانی پێکدێت بەپێی یاسای دەسەڵاتی دادوەری هەرێمی کوردستان، ژمارە ٣٧، ساڵی ٢٠٠٧، کاری دادگاکە بریتییە لەدادبینیکردنی سەرجەم ئەو دۆسیەیانەی کەدەچنە خانەی توندوتیژیی خێزانییەوە وەک لەخاڵەکانی سەرەوە رونکراوەتەوە. هەروەک دانیشتنەکانی دادگاکە بەشێوەی نهێنی بەڕێوەدەچێت. بۆ کاری لێکۆڵینەوەی دادییش لە دۆسیەکانی توندوتیژی، ئەوا وەزارەتی ناوخۆ بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت بەم بوارە دەکاتەوە، کاری بەڕێوەبەرایەتیەکە هاوشێوەی دادگا تایبەتمەندەکە، بریتییە لە بەدواداچون و لێکۆڵینەوە لە کەیسەکانی توندوتیژی لەژێر فەرمان و ئاگاداریی دادوەر دا.

> توندوتیژی خێزانی لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا بە ڕێژەی جیاواز بونی هەیە

یاسای ژمارە ٨ی ساڵی ٢٠١١ی تایبەت بە بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی، هەر بەتەنیا دادگاو وەزارەتی ناوخۆی نەخستوەتە بەردەم بەرپرسیارێتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەیسەکانی توندوتیژی، بەڵکو هەندێک وەزارەتی دیکەشی دەستنیشانکردوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دۆسیەیانە، بەتایبەتی قوربانیەکانی حاڵەتەکانی توندوتیژی. بۆنمونە وەزارەتی کاروکاروباری کۆمەڵایەتی دەبێت سەنتەرەکانی حەوانەوەی قوربانیانی توندوتیژی خێزانی ئامادە بکات، هەروەها هەندێکی تر لە قوربانیەکان تۆڕی پاراستنی کۆمەڵایەتی دەیانگرێتەوە کە ئەو دەزگایەش هەر سەر بە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتییە. ئەمە جگەلەوەی کە دەبێت وەزارەتی تەندروستی بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی، چاودیری تەندروستی شیاندنەوە «اعادە تاهیل»ی زەرەرمەندی توندوتیژی خێزانی بکات.

لەبارەی سزادانی کەسانێکەوە کە لەدادگا تاوانبار دەردەچن بەئەنجامدانی توندوتیژی خێزانی، ئەوا یاساکە بە دەق دەڵێت: «هەرکەسێک توندوتیژی خێزانی ئەنجام بدات سزادەدرێت بەگرتن لەشەش مانگ کەمتر نەبێت و لە ٣ ساڵ زیاتر نەبێت و بە بژاردن (غرامە) لە یەک ملیۆن دینار کەمتر نەبێت و لە پێنج ملیۆن دینار زیاتر نەبێت، یان بەیەکیک لەو دو سزایە».

جگە لە سزادانیش، یاساکە بوارێکی بۆ ئاشتبونەوەو ئاشتەوایی هێشتوەتەوە، بەشێوەیەک دادگا لایەنەکانی سکاڵا لەو کێشانەی دەکرێت ئاشتبونەوەی تێدا بکرێت رەوانەی لیژنەیەک بکات کە پێکدەهێنرێن لەشارەزایان وتایبەتمەندان بۆچاککردنەوەو و ئاشتبونەوەی نێوانیان، پێش رەوانەکردنی کێشەکە بۆ دادگای تایبەتمەند، بەمەرجێک ئەم هەنگاوە کارنەکاتە سەر رێکارەکانی پاراستن کە لەم یاسایەدا هاتوە.

# پزیشکێکی چاو: ژنانی گەرمیان زیاتر لەپیاوان سەردانمان دەکەن

▪ نەوژین، سۆزان خەلیل

**لەمیانەی ئەم دیدارەدا، د. کاوە محەمەد مەولود، پزیشکی ڕاهێنراو و شارەزا لە نەشتەرگەری و نەخۆشیەکانی چاو، باسلەدیارترین کێشە و نەخۆشیەکانی پەیوەندیدار بە چاو دەکات و لەو ڕووەوە ڕێنمایی و تێبینیی پێویست دەخاتە ڕو.**

**کەم خەوتن زیانی بۆ چاو هەیە و کێشەی بۆ دروست دەکات**

*** ئایا تیشکی خۆر هۆکارە بۆ دابەزینی چاو؟**

بەڵێ تیشکێک هەیە لەگەڵ تیشکی تر کەناسراوە بە تیشکی سەرو وەنەوشەیی ئەو تیشکە زەرەر ئەدات لە (چاو، ئاوێنەی چاو و گلێنەی چاو) زۆربەی جاریش تۆڕی چاو دەگرێتەوە ئەمەش ئەبێتە هۆکاری دابەزینی چاو چەندین کێشەمان بۆ دروست ئەبێت و چەندین نەخۆشی هەیە کە لە تەمەنی پیریدا دەردەکەوێت .

*** ئایا بەزیاد دابەزینی چاو دەبێتە هۆی کوێربون یان هیچ حاڵەتێکی لەو شێوەیە ڕوی داوە؟**

دابەزینی چاو دو جۆری هەیە یاخود نەخۆشیە یاخود لایەنێکی فیسیۆلۆجیە، ئەگەر نەخۆشی بێت ئەبێتە هۆی کوێربونی چاو و ئەگور فیسیۆلۆجی بێت ئەبێتە هۆی ڕوتانەوەی سەر، نەخۆشیەکمان هەیە پێی ئەڵێین «دەردەڕێوی» ئەمەش ئەبێتە هۆی روتانەوەی سەر ئەوەش هەر ڕوتانەوەیە چاویش بەو شێوەیە وایە، هەندێک نەخۆشیمان هەیە وەک گلێنەی قۆقزی و سستبونی چاو و هەڵئاوسانی سەنتەری بینینی چاو و یاخود ئاوی سپی ئەگەر ئەم نەخۆشیانە چارەسەر نەکرێت ئەبێتە هۆی کوێربونی چاو .

*** ئایا پێویستە چی بکەین بۆ ئەوەی چاومان بە پارێزراوی بمێنێتەوەو توشی دابەزینی چاو نەبێت؟**

هۆکار زۆرە بۆ ئەوەی خۆت بپارێزێ، بەڵام گرنگترین هۆکارەکان ئەوەیە کە خواردنی تەندروست بخۆیت و دور بکەویتەوە لە تیشکی ڕاستەوخۆی سەر و کەمکردنەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان.

*** ئایا بەکارهێنانی چاویلکە هۆکارە بۆ پاراستنی چاو و ئایا بە چاویلکە کردن چاو توشی دابەزین دەبێت؟**

نەخێر چاویلکەی تەندروستی هیچ زیانێکی نیەو باشترە، بەڵام کزبونی چاو ڕاناگرێت، بەڵکو باش پێی ئەبینێت ئەگەر ئەو چاویلکەی بۆی دانرابێت فلتەری تێبخرێت باشترە و چاوی زیاتر ئەپارێزێت.

*** زۆر سەیرکردنی شاشەی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان دەبێتە هۆی دابەزینی چاو؟**

ئەمە بابەتێکە لەژێر لێکۆڵینەوەدایە، بەڵام وەکو ئەوەی بینیومانە بەڵێ هۆکارە بۆ دابەزینی چاو بەتایبەتی لە گەنجان دا.

*** ئایا سەیرکردنی شاشەی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان لەشوێنی ڕوناک بۆ شوێنی تاریک جیاوازی هەیە بۆ زیاد دابەزینی چاو؟**

بەڵێ، ئەوەش ئەبێت ئەو کەسەی بەکاری ئەهێنێت ئەبێت نیو مەتر بۆ ٣٠ سانتیم لێی دوربێت و ئەبێت لە شوێنی ڕوناک بێت و بۆ ماوەیەکی کەمبێت بەلای کەمەوەپاش ١٠ خولەک ئەبێت ئیسراحەت بە چاوبیدات و سەیری دور بکات و سەیری ئەملاو ئەولای خۆی بکات، ئەگەر شوێنەکە تاریک بێت زیانی بۆ چاو هەیە .

*** ئایا هیچ شتیک هەیە ڕۆژانە بە شێوەیەکی پێویست بتوانیت بەکاری بهێنێت بۆ ئەوەی چاومان بە باشی بمێنێتەوە؟**

ڕۆژانە خواردنی تەندروست و خۆپاراستن لە تیشکی سەرو وەنەوشەیی، باشترین ڕێوشوێنن بۆ پاراستنی چاو.

*** ئایا تێپەڕ بونی تەمەن هۆکارە بۆ دابەزینی چاو؟**

بەڵێ بەهۆی تەمەنەوە چەندین کێشەمان بۆ دروست ئەبێت وەک ئاوی سپی و سستبونی دەماری چاو و سستبونی تۆڕی چاو.

*** ئەو شتانە چین کە خۆمانی لێ بەدور بگرین بۆ ئەوەی چاومان بە باشی بمێنێتەوە؟**

خواردنی تەندروست، بۆ نمونە: بادەمەکان و هەروەها میوەکان بەگشتی لەگەڵ ئەوەشدا شلیک و خەس ئەم خواردنانە هەموی بەسودە بۆ چاو، وەرزش و باش خەوتن ئەمانەش ڕۆڵیان هەیە، هەروەها تابتوانین خۆمان دور بگرین لە تیشکی ڕاستەوخۆی خۆر.

*** زۆر خەوتن هیچ کاریگەری لەسەر چاو هەیە؟**

زۆر خەوتن هیچ زیانێکی نیە، بەڵام کەم خەوتن زیانی هەیە و کێشەت بۆ دروست دەکات.

*** ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە بین هیچ تیشکی خۆر بەرمان نەکەوێت تا چەند زیانی هەیە؟**

ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە بیت کێشەت بۆ دروست ئەکات وەکو کەمبونی ڕێژەی ڤیتامین (D)، وەک لە لێکۆڵینەوەکاندا بۆمان دەرکەوتوە ئەو منالانەی چاویان کزە ڕێژەی ڤیتامین (D) یان کەمە.

*** ئایا دابەزینی چاو بە پلەی یەکەم لە چ ئاستی تەمەنێکدا ڕودەدات؟ یان پەیوەندی بە ئاستی تەمەنەوە هەیە؟**

پەیوەندی بە ئاستی تەمەنەوە نییە، بەڵام بەپێی تەمەنەکان دابەزینی چاومان هەیە لە منالدا ئەستیگماتیز لە گەنجدا نەقسمان زۆر هەیە واتە دور بینین لە بەتەمەنەکانیشدا کەم بینینمان هەیە، واتا شێوازەکەی دەگۆڕێت چونکە تایبەت نیە بە تەمەنەوە .

*** ئایا خێل بونی چاو هیچ چارەسەرێکی هەیە یان بە چاویلکە چارەسەر ئەکرێت؟**

خێل بونی چاو هۆکاری زۆرە هەندێک جۆر هەیە چاوی کزە ئاستی بینینی کەمە ئەمەیان چاویلکەی بۆ بکرێت باش ئەبینێت، بەڵام هەندێکی خوار کەوتە بۆ ناوەوە چوە بۆ دەرەوە چوە ئەوکاتە بە نەشتەرگەری چاک ئەبێت.

*** ئێوە ڕۆژانە زیاتر ئافرەتان سەردان دەکەن یاخود پیاوان؟**

زیاتر ئافرەتان سەردان دەکەن، بە حوکمی ئەوەی ئافرەتان زیاتر گرنگی بە خۆیان دەدەن.

*** ئامۆژگاریت چیە بۆ ئافرەتان بۆ پاراستنی چاویان بەتایبەت ئەوانەی کێشەیان لە چاویان دا هەیە؟**

ئامۆژگاریم ئەوەیە کە لەکاتی بونی هەر کێشەیەکدا ئافرەتان نابێت گوێی پێنەدەن، بەڵکو دەبێت بە زویی سەردانی پزیشک بکەن، چونکە ئەگەر سەردان نەکەن بۆ خۆیان زیانی هەیە.



# نەخۆشیی دڵ ... نەخۆشیە مەترسیدارەکەی ژنان

▪ نەوژین

**ئایادەزانیت ژنان سێ ئەوەندەی توشبون بە شێرپەنجەی مەمک، زیاتر ڕوبەڕوی مردن بەهۆی نەخۆشی دڵ دەبنەوە؟**
**بەپێی توێژینەوەوە زانستیەکان، ڕێژەی توشبونی ژنان بەنەخۆشیەکانی دڵ بەشێوازە جیاوازەکانییەوە، زیاترە لەزۆر نەخۆشی دیکە، بەتایبەتی ژنان پاش پێنانە ناو قۆناغی پچڕانی سوڕی مانگانەیان، زیاتر ڕوبەڕوی ئەم نەخۆشیی و حاڵەتە دەبنەوە.**

**ڕێژەی توشبونی ژنان بەنەخۆشی دڵ، زیاترە لەزۆر نەخۆشی دیکە**

لێرەدا چەند زانیارییەکی پێویست و گرنگ دەخەینە ڕو، کە ژنان لەڕێگەیانەوە دەتوانن بەر بە مەترسیەکانی نەخۆشیی دڵ بگرن.

### ١. پشکنین بۆ کۆلیسترۆڵ و فشاری خوێنت بکە

ئەگەر تەمەنت لەسەروی ٤٠ ساڵەوەیە، ئەوا ڕاوێژ لەگەڵ پزیشکەکەت دا بکە بۆ ئەنجامدانی پشکنینی پزیشکیی لەبارەی ئەوەی تاچەند مەترسیی نەخۆشیەکانی دڵت لەسەرە، بەتایبەتی گرنگە پشکنینی بۆ فشاری خوێنت و هەروەها ڕێژەی کۆلیسترۆڵی خوێن (واتا چەوری زیانبەخشی ناو خوێن) بکەیت.

ئەگەر ڕێژەی فشاری خوێنت یان کۆلیسترۆڵی خوێنت زیاد بو لە ڕێژە ئاساییەکە، ئەوا مەترسییت لەسەر دروست دەکات بۆ توشبونی نەخۆشیەکانی دڵ، ئەمەش بە ڕاوێژی پزیشک پێویست بە چەند هەنگاوێک دەکات کە بینەی.

### ٢. وەرزشکردنی بەردەوام

لەکۆی چوار ژن، تەنها یەکێکیان وەرزش ئەنجام دەدات بۆ دوربون لە توشبون بە نەخۆشیەکانی دڵ، کە ئەمەش مەترسیدارە.

بۆیە هەوڵبدە بە بەردەوامی و ڕێکی وەرزش بکەیت، بەتایبەتی هەردو وەرزشی: مەلەوانی و ڕێکردن.

پێویستە لەسەر هەمو ژنێک، هەفتانە ١٥٠ خولەک (دو کاتژمێر و نیو)، بەلای کەمەوە وەرزش ئەنجام بدات، بەتایبەتی وەرزشی (ئایرۆبیک) وەکو: ڕێکردنی خێراو و لێخوڕینی پاسکیل.

### ٣. کێشت دابەزێنە

لەکۆی هەر ١٠ ژنێک، ٦ دانەیان کێشان زیادە یاخود قەڵەون، ئەمەش وادەکات ئەم زۆر کێشییە، فشار بخاتە سەر دڵت، بەمهۆیەشەوە زۆرتر ڕوبەڕوی کێشەکانی پەیوەندیدار بە دڵ دەبیتەوە، لەوێنەی زیادبونی فشاری خوێن و بەرزبونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ، کە ئەم دوەش ئەگەری توشبونت بە نەخۆشیەکانی دڵ زیاتر دەکەن.

### ٤. خواردنت بگۆڕە

هەوڵ بدە گۆڕانکاریی لە شێوازی خواردنت دا بکەیت و پشت بەو خۆراکانە ببەستیت کە تەندروستن، بەتایبەت هەوڵی کەمکردنەوەی خواردنی خوێ بدە، بەشێوەیەک لە ڕۆژێک دا لە ٦ گرام زیاتر نەخۆیت.

لەپاڵ کەمکردنەوەی خوێ، خواردنە چەورەکان و چەوریی بەگشتی، کەم بکەرەوە، چونکە ئەویش هاوشانی خوێ مەترسیدارەو لەهۆکارە سەرەکیەکانی توشبونە بە نەخۆشیەکانی دڵ.

### ٥. ماندو بونی کەمبکەرەوە

بەپێی توێژینەوەیەکی زانستی، زۆر ماندو بون هۆکارێکی کاریگەرە بۆ توشبون بە نەخۆشیەکانی دڵ. بۆیە ئەگەر پێتوایە زۆر ماندویت یان زۆر ماندو دەبیت، ئەوا پێویستە پشو بدەیت و خۆت فێریی ئەوە بکەیت چۆن پشو وەربگریت.

ڕێگاکانی پشو وەرگرتن و کەمکردنەوەی ماندوێتی زۆرن، بەڵام بۆ دڵنیایی زیاتر، دەتوانی ڕاوێژ بە پزیشکێکی پسپۆڕ بکەیت.

# «کچناسی» ...
# بوارێکی نوێ بۆ ئاشنابون بە کێشەکانی کچان



▪ ئاسیا حسێن

**کچناسیی، بریتیە لە بوارێکی ئەکادیمی بۆ شیکردنەوەی هەمو ئەو باسانەی پەیوەندییان بە کچەوە هەیە. زانیارییەکانی ئەم بوارە ڕاستەوخۆ لە جیهانبینی و فیکر و هۆشی کچانەوە وەردەگیرێن و دواتر بەوردی شیکار دەکرێن لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە. ئەم بوارە بە شێوەیەکی ڕەسمی لە دوای ساڵی ١٩٩٠ دەرکەوت، سەرەتا بەشێک بو لە بواری ژنناسی.**

پسپۆرانی بواری کچناسیی تەنها تەمەنی هەرزەکاری و لاوێتی ناخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بەڵکو سەرنجی ئەو لایەنە کۆمەڵایەتـــی و کلتورییانـــەش دەدەن کـــە کاریگەرییان هەیە لەســـەر کچان. توێژەرەکانی بواری کچناســـیی سەرەتا لە چەند بوارێکی تریشدا توێژینەوەیان کردوە، وەکو بوارەکانی: (کۆمەڵناسی، دەرونناسی، پەروەردە، مێژو، ئەدەبیات و بوارەکانـــی تایبەت بـــە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان).

هەروەها ڕاستەوخۆ لەگەل خودی کچاندا کار دەکەن بۆ کۆکردنەوەو دەستکەوتنی زانیاری و داتا لەسەر بارودۆخی ژیانیان و کاریگەریی کۆمەڵگا لەســـەر ئەوان، یاخـــود کاریگەریی ئـــەوان لە کۆمەڵگا دا.

ئەم بوارە لەدوای ســـاڵی ١٩٩٠ەوە بە گشتی پەرەی پێدرا و گەشەی سەند لە ئەنجامی زیادبونی گفتوگۆ و توێژینەوە لەســـەر بەشـــداری پێکردنی کچان لە بوارە زانســـتیەکانی وەکـــو بیرکاری و تەکنەلۆژیا. پێش ئەمەش ئەم باســـە جێی ســـەرنجی توێژەرانی بزوتنەوەی فێمێنیســـتی بوە، لەســـاڵانی ١٩٧٠دا ئەوەیان خستەڕو کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ســـود وەرگرتن لە تونای کچان و کوڕان لە بوارە زانســـتییەکان دا.

Angel McRobbie, Meda Chesney – Lind, Christine Griffin بەشـــێک بون لەو توێژەرانەی ســـەرنجی کەمی باس و لێکۆڵینەوەیان دەدا لەســـەر کچ و بواری کچناســـیی. لەســـەرەتای ســـاڵی ١٩٩٠دا، زانکۆی Harvard پرۆژەیەکـــی ڕاگەیانـــد بۆ لێکۆڵینـــەوە لە (بـــاری دەرونی کچان و پەیوەندیەکانیـــان لـــە کۆمەڵگادا). لـــەم پرۆژەیەدا ئـــەوە خرایە بەر باس کە کچانـــی لاو هەســـت و بیرکردنەوە ڕاســـتەقینەکانی خۆیان دەشـــارنەوە لە مـــاوەی پەیوەندیەکانیاندا. بەمەش ڕادێن لەسەر شاردنەوەی هەستەکانیان تا کۆتایی تەمەن.

پاشان یەکێتی ژنانی زانکۆکانی ئەمریکا ڕاپۆرتێکـــی بڵاوکـــردەوە ســـەبارەت بە: (کاریگـــەری ئەزمونـــە دەرونی و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر کچان)، ئەمەش بو بە یەکەمیـــن ڕاپۆرتی نێو دەوڵەتی بۆ دروســـتکردنی پەیوەنـــدی لە نێوان دەرونی کچان و ئەزمونەکانیان لەماوەی خوێندنـــی قوتابخانـــەدا. دوابـــەدوای ئەمانـــە چەند ڕاپـــۆرت ولێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی پچڕ پچڕ، لەسەر بواری کچناســـیی ئەنجامـــدرا و لـــە کوتاییدا لە ســـاڵی ١٩٩٠، بواری کچناســـیی بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕاگەیەنرا و پسپۆڕان لێکۆڵینەوەکانیان ســـەبارەت بە کچان چڕ تر کردەوە.

گەشەسەندنی کچناسیی وەکو بوارێکی تایبـــەت و جیاواز، هـــاوکات بو لەگەڵ گەشەکردنی چەند بوارێکی تری تایبەت بـــە کچان، وەکـــو: بەشـــداری کردنی کچان لـــە ڕاگەیاندنەکاندا یان لە بواری فاشیۆن، هاوکاتیش بو لەگەڵ گەشەی بزوتنـــەوەی فێمێنیســـتی و کێشـــەی ڕەگەزەکان.

لە ساڵی ٢٠٠١دا، چەند توێژەرێکی وەکو Claudia MItchell , Jacqueline Reid-Walsh, Jackie Mitchell, Jack Krik، توانیان بە سەرکەوتویی بوارێکی تایبەت بـــە کچان بکەنەوە بە نـــاوی: (داواکاریـــی و داهاتوی کچی مۆدێرنە). پاشان گۆڤارێکیان دامەزراند بەناوی (کچناسیی، گۆڤارێکی تایبەت بە کچان).

ســـەرهەڵدان و گەشەســـەندنی بواری کچناســـیی توانی پێناســـەی کچ بکات وەکو بەشـــێکی کاریگـــەر لە کۆمەڵگا، جیاواز لە ژنان، چونکە جیاوازی بەرچاو هەیە لە نێوان ئـــەو دو گروپە لە روی کۆمەڵایەتی و دەرونییەوە.

لە ماوەی سەرهەڵدان و گەشەسەندنیدا، بـــواری کچناســـیی لەلایـــەن چەنـــد توێژەرێکەوە ڕەخنەی لێگیراوە، بۆنمونە ڕەخنەی ئەوەی کە کێشە و ئاڵۆزییەکانی کچان بەردەوام لە گۆڕاندان بۆیە دەبێت ڕۆژ بـــە ڕۆژ داتـــا و زانیاریەکانی ئەو بوارە نوێبکرێنەوە یان ڕەخنەی ئەوەی کە ئەو بەشە تەنها گرنگی بە کچەکانی ڕۆژئـــاوا دەدات و کچێک لە بەشـــێکی تری جیهانەوە ناتوانێت لێی تێ بگات و ئومێدێکی پێی هەبێت.

لەگـــەڵ ئەمەشـــدا بوارەکە بـــەردەوام لەگەشەســـەندن دایـــە و توانیویەتـــی چەندین گروپ و بزوتنەوەی تایبەت بە کچان بنیـــات بنێت و پەرەیان پێبدات، بەئامانجـــی ڕونکردنـــەوەی هەمو ئەو بوارانەی پەیوەندییان بە لایەنی دەرونی و کۆمەڵایەتی کچانەوە هەیە.

---

# نهێنییە شاراوەکانی خانمانی جوان پۆش چییە؟!

▪ نەوژین، سێوە محەمەد

**هەموومان هاوڕێ و هاوپیشەو دۆست و کەسانێکمان لە دەورووبەردا هەیە ، کە مۆدەی ڕۆژ یان دوا مۆدیلی پۆشاک دەپۆشن، بە دڵنیایەوە هەمومان ئەو پرسیارەمان لا دروست دەبێت: ئایا ڕاز ونهێنی جوان پۆشی ئەم دەستە کەسانە چییە؟ یان نهێنی ڕوخسارە سەرنجڕاکێشەکانیان چییە؟**

دیارە ئەم دەستە کەسە جوان پۆشانە کۆمەڵێـــک نەریتی تایبـــەت بە خۆیان هەیە، بە دڵنیایـــەوە ئەم نەریتانەش هۆکاری جوان پۆشییانە.

لە ڕێگەی ئـــەم ڕاپۆرتەوە ئاشـــناتان دەکەین بەو نەریت و نهێنییانە.

١. بە قیاس و ئەندازەی خۆیان پۆشاک دەپۆشن

یەکێک لە گرنگتریـــن بنەماکانی جوان پۆشـــی کە زۆرێک لە شارەزایانی جوان پۆشـــی ئاماژەیان پێکردوە ، پۆشینی پۆشاکە بە ئەندازە و قیاسی کەسەکان خۆیان.

ئەم دەستە کەسە جوان پۆشانە هەمیشە بە ئەندازەو قیاســـی خۆیان پۆشـــاک دەپۆشـــن، دیارە پۆشاکی شل و شۆڵ یان زۆر تەســـک هەرگیز بەو شیوازەی کە مەبەســـتانە کەشـــخەتان ناکات و شێوازێکی جوانتان پێ نابەخشێت.

٢. دەزانن چیان دەوێت

یەکێک لە هەڵە باوەکانی خانمان ئەوەیە کە بە تەئکیدی نازانن چییان دەوێت و بەدوای چییەوەن! لـــە ئەنجامدا جۆرە پۆشاکێک و جوانکارییەک هەڵدەبژێرن هیچ تەنسیقێکیان لەنێواندا نییە.

خانمانی جـــوان پۆش بەشـــێوەیەکی گشـــتی لەســـەریەک شـــێواز پۆشاک ڕێکدەخـــەن و دڵنیان کە شـــێوەیەکی جوانیان پێ دەبەخشێت .



٣. هەمیشە شـــێوازی تایبەتی خۆیان هەیە

هەوڵبدەن هەمیشە بە متمانە بەخۆبونی تەواوەوە شـــێواز و ستایلی جلوبەرگی تایبەتـــی خۆتان دابڕێـــژن، هیچ کات بـــەدوای تەقلیدکردنـــەوەی کەســـانی دەوروبەرتان مەبن.

٤. پۆشـــاکەکانیان لە گەڵ کەشوهەوا دەگونجێنن

ئەو پۆشـــاکەی کە دەیپۆشـــن، دەبێت لەگـــەڵ کەشـــوهەوا گونجـــاو بێت، بۆ ئەوەی لەبەر دیدی کەسانی دەوروبەرتان نەبنە مایـــە گاڵتەجاڕیی، ئەمە یەکێکە لـــە بنەماکانـــی جوان پۆشـــی، لەو ڕووەوە هەرگیـــز لـــە هاوینانـــدا جلـــی ئەســـتورو خوریی و نایلۆنیی مەپۆشن، بەپێچەوانەشـــەوە لە زستان دا بەدوای جلـــی درێژ و تەنکـــەوە مەبن، چونکە گاڵتەجاڕانە دەرئەکـــەون، بۆیە بەپێی کات و وەرزەکان بپۆشـــن بـــۆ ئەوەی شیک دەرکەون.

٥. دەزانن چ کاتێک پێڵاوی پاژنە بەرز لەپێدەکەن

هەڵبژاردنـــی پێـــڵاوی پاژنەبـــەرز یان جوتـــێ کالـــە تایبەتمەندێتـــی هەیە و بەستراوەتەوە بە کات و شوێنەوە.

دیارە لەپـــێ کردنی پێڵاوی پاژنە بەرز بـــۆ شـــوێنی کار و هەڵبژاردنی جوتێ کالە بـــۆ ئاهەنگ و دەرچونی تایبەتی، شتێکی جوان نابێت.

٦. کاتێکی بـــاش بە خۆیان دەدەن بۆ ئامادەکردن

لە کاتـــی خۆ ئامادەکردن بۆ ئاهەنگ و دەرچون و یان هەر بۆنەیەکی تایبەتی، یەک ڕۆژ پێشتر جلی گونجاو و تایبەت بۆ ئەو بۆنەیە ئامادە دەکەن.

بـــەم کارەش دوور دەبێت لە دڵەڕاوکێ و شـــڵەژان و ئارامیـــی تـــەواوی پـــێ دەبەخشـــێت و لە کاتی گونجاو ئامادە دەبێت.

---

## دەربارەی
## نەوژین

نەوژیـــن، ڕۆژنامەیەکـــی ســـەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایـــەن ڕادیـــۆی دەنگ لـــە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

ڕادیۆی دەنـــگ، پرۆژەیەکـــی میدیایی ســـەربەخۆیە لە ناوچـــەی گەرمیان، لە (٢٠١٠)ەوە بـــە پەخشـــی ڕادیۆیەکـــی لۆکاڵـــی دەســـتی پێکردوەو پاشـــان وێبسایتێکی داناوە.

ڕۆژنامـــەی (نەوژیـــن) یەکێکـــە لـــە چالاکیەکانـــی پرۆژەی ڕادیـــۆی دەنگ بە پاڵپشـــتی ســـندوقی نیشـــتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

ڕۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەیەکـــی ڕادیۆی دەنـــگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

ڕۆژنامەنوسانی ئەم ڕۆژنامەیە، ژمارەیەک کچـــن کەپێشـــتر خولێکـــی ڕاهێنانیان لەلایەن ڕادیۆی دەنگەوە بۆئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشـــتر کاری ڕۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە ڕۆژنامەکەوە:

تەلەفۆن:

٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠

ئیمەیڵ:

nawzhinnewspaper@gmail.com

فەیسبوک:

nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی ڕادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە ببینن

www.radiodang.org

# کچە هونەرمەندێکی کفری خەونی بون بە ئەستێرەی هەیە



(ژینۆ) لە دیمەنێکی درامای (سەراب) دا

■ نەوژین، ئەحمەد حەمید

**ژینۆ گەنجێکی دانشتوی قەزایی کفرییە و دەیەوێت ئەو خەونەی لە منالّیەوە هەیەتی بەدیی بێنێت و ببێتە یەکێک لە ئەستێرەکانی هونەری شانۆ و نواندن.**

**ژینۆ، نۆزدە بەهاری تەمەنی بەڕێکردوە و لە منالّیەوە خولیای کاری نواندن بوە و تا ئێستاش بەردەوامە.**

ژینۆ سەرتیپ، خوێندکاری قۆناغی چوارەمی بەشی شانۆیە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری، تا ئێستا بەشداری چەندین کاری شانۆی کردوە دواین کاریشی بەشدریکردنە لە درامایەکدا.

ئەو لە بارەی هۆکاری هەڵبژاردنی بەشی شانۆ و خولیای بۆ کاری هونەری دەڵێت: «هەر لە منداڵیەوە خولیام کاری نواندن بوە و سەرەرایی ئەوەی لە پۆلی نۆی بنەرتی نمرەی بەرزم بەدەست هێنا بەڵام هونەرە جوانەکان و خولیاکەم بەگرنگتر زانی و لەوێ درێژەم بە خوێندندا.»

سەرباری هەبونی ئاستەنگ لە بەردەم کارەکەیدا وەک خۆی دەڵێت کۆڵی نەداوە و بەردەوامە لە بەرزکردنەوەی تواناکانی و ئەنجامدانی نمایشەکانی.

ژینۆ باس لەوە دەکات: «تا ئێستا بەشداری پێنج کاری شانۆیم کردوە کە دواین کاری شانۆیم شانۆیەکی مۆنۆدرامابو لە رۆژی جیهانی شانۆ نمایشم کرد، ئەو کارەش لە نواندن و دەرهێنانی خۆمبو.»

ئەو کە بە گەشبینیەکی زۆرەوە قسەی بۆ نەوژین دەکرد و باسی سەرکەوتنەکانی خۆی دەکرد ئاماژەی بەوەش کرد: «کە دەمەوێت ئەو ماوەیەی لە خوێندن ماومە پلەی یەکەم بەدەست بهێنم وەکو ساڵانی پێشوم.»

درامایی «سەراب» ئەو درامایەیە کە ژینۆ رێگایەکی دوری بۆ دەبڕێ تا وەکو بەشداری تێدا بکات و رۆڵی تێدا ببینێت.

لە نێو درامایی سەرابدا کە باسی کێشە کۆمەڵایەتیەکان دەکات ژینۆ رۆڵی کچێک دەبینێت کە کورێک خۆشی دەوێت و بە هۆی ئەوەی ناگونجێن ژینۆ رۆژی هاوسەرگیریان دوادەخات تاوەکو لە کۆتاییدا جیادەبنەوە.»

دراماکە لە سلێمانی کاری دەرهێنانی بۆ کراوە و وێنەگرتنی تەواو بوە و ئێستا کاری مۆنتاژی بۆ دەکرێت و بەمزوانە بڵاودەبێتەوە.

ئەو کە ئومێدێکی زۆر لە قسەکانیدا هەستی پێدەکرا باسی لەوە دەکرد کە شانۆ خولیای ئەوە و دەڵێت: «ئەو کاتانەی سەرقاڵی کارە شانۆییەکانم دەبم زیاتر دەرونم ئارام دەبێتەوە».

هەرچەندە هەندێک جار کۆمەڵگا دەبێتە رێگر لە بەدیهێنانی خەون و خولیایی تاکەکانی کۆمەڵگا بەڵام لای ژینۆ پێچەوانەیە و کۆمەڵگا نەیتوانیوە رێگە لە بە دیهێنانی خەونەکانی بگرێت.

ژینۆی شانۆکار دەشڵێت: «ماڵەوە نەبونەتە رێگر لەبەردەم کارەکانم و براکەم هاندەرێکی باشمە، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی سەرکەوتنم.»

جەختیشدەکاتەوە: «گرنگی بەو رێگریانە نادەم کە کۆمەڵگا بۆم دەخوڵقێنێ و خەیاڵەکانم لەگەڵ هونەر ئاوێزان دەکەم.»





# خەنە، ئەو مادە جوانکارییەی کۆن نابێت

■ نەوژین، دیلان ئەکرەم

**خەنە یەکێکە لەو ناوانەی زۆربەی کچان ئاشنان بە ناوەکەی و بۆ جوانکردنی پرچیان بە کاری دێنن، هەرچەندە بەردەوام مادەی نوێ بۆ بەهێزکردن و جوانکردنی پرچ بەرهەم دێت بەڵام خەنە گرنگی خۆی لە دەست نەداوە.**

> (١٣) ساڵە خەنە بەکاردێنم سودی زۆری بۆ پرچم هەبوە

> خەنەی کوردیی بە تەواوی سروشتیە و داوای زۆری لەسەرە

خەنە چەند جۆرێکی هەیە و زۆرینەی ئەو کچ و ژنانەی خەنە بە کاردەهێنن بێ سەردانی دکتۆر و بێ رێنمایی پزیشک بەکاری دەهێنن.

رێژاو محەمەد، کەتەمەنی (٤٢) ساڵە، بۆ (نەوژین) وتی: «ماوەی (١٣) ساڵە خەنە بەکاردێنم سودی زۆری بۆم هەبوە، پرچم بە هێزتر و پڕترە.»

رێژاو، وتیشی: «هەفتەی جارێک خەنە بەکاردینم و هیچ ترسم لەبەکارهێنانی نیە، بەهۆی خەنەوە قژەکەم تەندروستە.»

خەنە جگە لەوەی بۆ جوانکردنی پرچ و بەهێزکردنی بەکاردەهێنرێت، ئافرەتان بۆ جوانکاریش بەکاری دەهێنن.

یەکێکی دیکە لەو کچانەی بۆ (نەوژین) دوا، چێلەر عوسمان، ٢١ساڵە، ئەو دەڵێت: «زۆر گرنگی بە پرچم دەدەم و بەردەوام خەنە بۆ پرچە درێژەکەم بەکاردەهێنم.»

چێلەر، باسلەوەدەکات «کەمتر لە ساڵێکە خەنە بەکار دەهێنم و تا ئێستا سودی زۆری هەبوە و زۆر ئاسودەم کە خەنە بەکاردەهێنم.»

ئەو وتیشی: «پێشتر بۆیەم بۆ پرچم بەکاردەهێنا و دایک و خوشکانم خەنەیان بەکاریان دەهێنا و دواتر منیش خەنەم بەکارهێناو بەراورد بە بۆیەکە پرچم جوانتر و باشتر بوە.»

یەکێک لەو گرفتانەی کچان و ژنان لە بە کا رهێنا نی خەنەدا توشیان دەبێت ئەوەیە کە دواتر بە ئاسانی ناتوانن رەنگی پرچیان بگۆڕن.

محەمەد ئەمین، خاوەنی یەکێک لەو دوکانانەیە کە کاری فرۆشتنی خەنە دەکات (عەتار) بە (نەوژین)ی وت: «ماوەیەکە گەنجان بەشێوەیەکی بەرچاو رویان لە بەکارهێنانی خەنە کردوە، وەک ئەو گەنجانە خۆیان دەڵێن چارەسەری پرچی زۆرینەیانی کردوە.»

محەمەد کە نۆزدە ساڵە سەرقاڵی ئەو کارەیە دەڵێت: «خەنەی خۆمان داوای زۆری لەسەرە، چونکە بە تەواوی سروشتیە، بەڵام ئەوەی پێی دەوترێ (ئیماراتی- سعودی) بڕێکی زۆر مادەی کیمیای تێدایە کە زیانیکی زور بە پرچ دەگەیەنێت.»

زۆرینەی کچان و ژنان بەبێ سەردانی دکتۆر و بێ رێنمایی تەندروستی، خەنە بە کاردەهێنن و جیاوازی پێست و هەستیاری پێستیش لە هەندێک کاتدا وابکات لە بری سود زیانی هەبێت.

د.ئەیاد فوئاد، پزیشکی پسپۆر لە نەخۆشیەکان پێست لە بارەی بەکارهێنانی خەنەوە بۆ (نەوژین) وتی: «هەرچەندە پێش پێشکەوتنی زانست خەنە وەک چارەسەر بۆ کۆمەڵێک نەخۆشی پێست بە کارهاتوە بەڵام خەنە لە لایەنی پزیشکیەوە وەک چارەسەر بەکارناهێنرێت.»

وتیشی : «ئەوەی کە پێی دەوترێ خەنەی کوردی تا ئێستا وەکو حاڵەتێک نەهاتوەتە لامان کە زیانی هەبوبێ، بەڵام هەر جۆرێکی دیکەی گەر مادەی کیمیایی تێدا بێت زیانی هەیە و حاڵەتی لەو جۆرەشمان هەیە.»

ئەو پزیشکە ئاماژەی بەوەشکرد: «باشتر وایە و بۆ ئەوەی زیان بە پرچیان نەگات، پێش بەکارهێنانی سەردانی کەسانی پسپۆر بکرێت.»